چاپی دووەم




# پارادۆکسی نووسین

ڕەبیع جابر
وەرگێڕ: شوان ئەحمەد








# ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە

بەڕێوەبەری گشتیی ناوەند: هەژار مەجید
بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: سیروان مەحمود
بەڕێوەبەری هونەری: باسم ڕەسام

ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە - ناوەندی بڵاوکردنەوەی ئەندێشە
سلێمانی - شەقامی مەولەوی - تەلاری بازرگانیی سیروانی نوێ - نهۆمی چوارەم
http://www.endeshe.org
andesha.libraray@yahoo.com ● andesha@outlook.com
http://www.facebook.com/Andeshalib
07501026400



# پارادۆكسی نووسین

رەبیع جابر

وەرگێڕ: شوان ئەحمەد



زنجیرەکتێبی فیکر و ئەدەب

سەرپەرشتیاری زنجیرە

سیروان مەحمود

ناوی کتێب: پارادۆکسی نووسین
ناوی نووسەر: ڕەبیع جابر
وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد
بابەت: ئەدەب
دیزاینی تێکست: دانا حەسەن
نۆبەتی چاپ: دووەم ٢٠١٦
چاپخانە: تاران
تیراژ: (١٠٠٠) دانە
نرخ: (٣٠٠٠) دینار
ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٠٥٢)ی ساڵی (٢٠١٦)ی پێ دراوە.

# ناوەڕۆک

# بەرایی

نووسەری ئەم وتارانە، ڕۆماننووسێکی لاوی لوبنانییە. ڕەبیع جابر تەمەنی تەنها سیونۆ ساڵە و خاوەنی حەڤدە ڕۆمانە. ساڵی ١٩٧٢ لە بەعقەلین لە بەیروت لەدایک بووە، ساڵانی شەڕی ناوخۆی وڵاتەکەی ١٩٧٥-١٩٩٠ لە جەبەل لوبنان گوزەراندووە. بەشی فیزیای لە زانکۆی ئەمەریکی لە بەیروت تەواو کردووە. ماوەیەک سەرپەرشتیاری پاشکۆی أفاق بووە لە ڕۆژنامەی *الحیاة*.

ڕەبیع جابر نووسەرێکی گۆشەگیر و کەمدووە، بەڵام نووسەرێکی چالاک و پڕبەرهەمە. دونیای ئەو، خوێندنەوە و نووسینە، بەتایبەت خوێندنەوەی ڕۆمانە کلاسیکی و کتێبە ئەستوورەکان... کوشتەی مێژووە، مێژووی مرۆڤ و ڕووداوەکان. وەک ئەمین مەعلوف، مێژوو پانتاییەکی گەورەی ڕۆمانەکانی داگیر دەکات. هەر لە *پادشای تاریکییەوە* بۆ *چایی ڕەش* و *پەپوولەی شین* و *یوسفی ئینگلیزی* و *درووزەکانی بولگراد* و *ڕاپۆرتی میلیس* و *ئەمەریکا* و *شازادە بووم* و *بێرتیۆس* و *ڕاڵف ڕزقەڵلا لە ئاوێنەدا* و *بەیروت شاری دونیا* و... هتد.

شایانی باسە، ساڵی ١٩٩٢، کاتێک لە تەمەنی بیست ساڵیدا دەبێت، لەسەر ڕۆمانی پادشای تاریکی خەلاتی ڕەخنەگران بۆ ڕۆمان وەر دەگرێت. وتارەکانی ناو ئەم کتێبە، سەفەرێکن بەناو دنیای ڕۆمان و نووسیندا. لە هەریەک لەو وتارانەدا، زۆر بەقووڵی باسی دژواریی پرۆسەی نووسین و جیهانی ڕۆمان دەکات، لای ئەو ڕۆماننووسە مەزنانەی لە ئێستا و ڕابردوودا چەندین بەرهەمی ناوازە و دانسقەیان پێشکەش کردووین.

خوێندنەوەی وتارەکانی ناو ئەم کتێبە، زانیاریی سەیر و بێشومارمان بەردەست دەخات و ئەوەمان پێ دەڵێت، کە نووسەرەکەی چ سەروکارێکی لەگەڵ جیهانی ڕۆمان و خوێندنەوەدا هەیە. ئەم وتارانە لە یەک کاتدا هەم سەرچاوەی زانیارین و هەم سەرچاوەی چێژبەخشینن.

وەرگێڕ

٢٠١٠/١٢/٢٣

# پارادۆکسی نووسین

بۆچی خوان ڕۆڵفۆ دوای *پیدرۆ پارامۆ* هیچی نەنووسی؟ بۆچی پاتریک ساسکەند دوای حیکایەتی *مسیۆ سومەر* بێدەنگ بوو؟ خوان ڕۆڵفۆ، توانیی بە نووسینی دوو کتێب، ببێتە نووسەری یەکەمی مەکسیک. لە پەنجا و شەستەکانی سەدەی ڕابردوودا، ڕۆمانی پیدرۆ پارامۆ بوو بە دیاردەیەکی ئەدەبی.

مارکیز باسی کاریگەریی ئەو تێکستە دەکات لەسەر *سەد ساڵ تەنیایی*. ئەو وێنە فۆتۆگرافییانەی پێدەشتەکانی مەکسیک، کە ڕۆڵفۆ گرتوونی، بە ڕۆمان و کورتەچیرۆکەکانی دەچن. کۆمەڵەچیرۆکی *پێدەشتی سووتاو*، لێوانلێوە لە توندوتیژی و سروشتێکی سەخت و تاقەتپڕووکێن، بەڵام هاوکات پڕیشە لە ژیان.

هەوڵی بێوچان بۆ لەتێک نان و بۆ قومێک ئاو، بۆ حەسانەوەیەک دوای ماندووبوونێکی زۆر. ڕەنگە ئەو پشوو و حەسانەوەیە، تەنها بە گوللە و چەقۆ دەستگیر ببێت. کۆتا دیمەنی ڕۆمانەکەی گابریێل گارسیا مارکیز، *ڕووداوی مەرگێکی ئاشکرا*، خوان ڕۆڵفۆ دووبارە دەکاتەوە و

سەرلەنوێ دروستی دەکاتەوە.

مارکیز خوان ڕۆلفۆ بەجێ دەهێڵێت، بەڵام ڕۆلفۆ لەپشت کارەکانیەوە ئامادەیە. ئەکرێت بڵێین مارکیز و ڕۆلفۆ هەردووکیان پێکەوە، کەسی سێیەم دووبارە دەکەنەوە، کە کەسێکی نادیارە. ئەبێت ئەو کەسە کێ بێت؟ تۆ بڵێی هۆمیرۆس بێت؟

ئەو دیمەنە پڕتوندوتیژییانەی ئەدەب، پرسیارێک دێنێتە ئاراوە: بۆچی نووسەر ئەم شتانە دەنووسێت؟ ئەگەر ئامانجی ئەدەب ئەوەیە جوانی بوونیاد بنێت، بۆچی باس لە توندوتیژی و شەڕانگێزی و وێرانکاری دەکات؟ بەڵام ئاخۆ ئەدەب هیچ ئامانجێکی هەیە؟ فلۆبێر لە نامەکانیدا باس لەوە دەکات، کە دەیەوێت کتێبێک بنووسێت، خوێنەرانی تووشی هەمان ئەو سەرسووڕمانە بکات، کە لە بەردەم دیمەنێکی سروشتیدا هەستی پێ دەکەن.

دەیەوێت کتێبێک بنووسێت، لەو دیوار و پایە کۆنانە بچێت، کە لەسەر گرد و تەپۆڵکەکانی یۆنان بوونیاد نراون. فلۆبێر چی دەڵێت؟ دوای یەکەمین ڕۆمانی، *خاتوو بۆڤاری*، دەیویست ببێتە عارفێک و لە پاریس و خەڵکوخوا دوور بکەوێتەوە. دەیویست لە ژوورێکی داخراودا بنووسێت. شۆرەت و نێوبانگی خاتوو بۆڤاری ماندووی کردبوو. بە هاوڕێکانی ڕاگەیاند، بە تۆمەتگەلێک ڕاپێچی دادگا دەکرێت، دوورونزیک پەیوەندییان بە ئەدەبەوە نییە.

خاتوو بۆڤاری بە زنجیرە لە ڕۆژنامەیەکی ئۆپۆزسیۆندا بڵاو دەکرایەوە، کە دەسەڵات دەیویست دای بخات. دووەم ڕۆمانی، *سالامبۆ*، بەسەرهاتەکانی لە سەردەمانی کۆندا ڕوو

دەدات (لە قرتاجە و سێ سەدە بەر لە زایین). فلۆبێر لە هەراوزەنای جیهانی مۆدێرن و ململانێ بێتامەکانی هەڵهات، هەڵهات ڕووەو مێژووی کۆن. دوای چەند ساڵێک، شەڕی پروسیا–فەرەنسا دەستی پێ کرد و ماڵەکەی پڕ بوو لە سەرباز. سەیری ئەو دنیا بەلەسەیەی دەکرد و تێنەدەگەیشت مرۆڤ چۆن دەگاتە ئەو ئاستە؟ بەڵام چۆن مرۆڤ بەو ئاستە قێزەونە ناگات؟

خوان ڕۆڵفۆ بۆچی وازی لە نووسین هێنا؟ بۆچی ساسکەند هەر بێدەنگە؟ هەردووکیان بۆ تەلەڤزیۆنیان نووسی، ڕۆڵفۆ بۆ سینەماشی نووسی. *عەتر* یەکەمین ڕۆمانی و سایسکەندە کراوەتە فیلمی سینەمایی. ئایا عەتر بێدەنگیی ساسکەندمان بۆ ڕوون دەکاتەوە؟ بۆچی ساسکەند چیرۆکی بکوژێکی سەیر دەنووسێت، کە لە پاریسی سەدەی هەژدەهەمدا ژیاوە؟ ئەی بۆچی دوای ئەوە چیرۆکی پاسەوانێک دەنووسێت، *پاسەوانێک ترس دەیخوات* و لە پاریسی سەدەی بیستەمدا دەژی؟ *کۆتر* نۆڤلێتێکە دەربارەی پیاوێک، بە دەرکەوتن و بینینی کۆترێک لە بەردەم دەرگای شوقەیەکدا، سەرلەبەر هەموو ژیانی دەگۆڕێت.

لە ڕاستیدا، ئەوەی ئەو پیاوە هەیەتی، شوقە نییە، ژوورێکی خزمەتکارانەی بێ ئابخانە. زۆر بچووک و تەنگەڵان، بەڵام ئەو کردوویەتی بە ماڵی خۆی. کردوویەتی بە پەناگەیەکی ئارام، لەم دنیا شلۆق و سیاچارەیەدا. ئایا ساسکەند ترس و بیمی خۆی دەنووسێتەوە، یاخود بۆچوونی تایبەتیی خۆی لەسەر مرۆڤ بەیان دەکات؟ بۆچوونی خۆی لەسەر مرۆڤ؟ ئەمە چییە؟ ئەی خۆیشی وەک ئەوان مرۆڤ نییە؟

کاو کسینگان لە وتارەکەیدا لە بەردەم ئەکادیمیای سویدی بۆ خەڵاتی نۆبڵ، ڕای گەیاند، "نووسەر ویژدانی گروپ نییە." نووسەر کەسێکی تاک و تەنهایە و دەیەوێت بڵێت، دەیەوێت قسە بکات. بەردەوامیش ترسی ئەوەی هەیە، بێدەنگ بکرێت و زیندەبەچاڵ بکرێت. ئایا کسینگیان ئەم شتانەی وتووە؟ کسینگیان دەگەڕێتەوە لای فرانس کافکا و فێرناندۆ پێسوا و دەڵێت، "ئەوان هیچیان بۆ خـــاتری دنیا نەیاننووسی... هیچکـــامیشیان خوازیاری نێوبانگ و شکۆمەندی نەبوون. ئەوان بۆ خاتری ئەوە دەیاننووسی، هاوسەنگیی ناوەکیی خۆیان ڕابگرن. بۆ ئەوە دەیاننووسی، چونکە ئەوان ئەو ژیانەیان پێ عەتا کرابوو."

کافکا لە *ڕاپۆرتێک بۆ ئەکادیمیا*دا، باس لە چیرۆکی مەیموونێک دەکات، کە دەبێت بە مرۆڤ. مەیموونەکە بەسەرهاتی خۆی بۆ ئێمە و بۆ ئەکادیمیاکە دەگێڕێتەوە. باس لەوە دەکات، چۆن لە دارستانەکەدا گرتوویانە و چۆنچۆنی گواستوویانەتەوە بۆ ناو کەشتییەکە، لە کەشتییەکەدا، بەبرینداری لە قەفەسێکدا زیندانیی دەکەن.

مەیموونێک ڕاپۆرتێک دەربارەی ژیانی خۆی دەنووسێت و دەڵێت، لە قەفەسدام. پاشان تێدەگات تاکە ڕێگەی بۆ دەرچوون لەو قەفەسە، ئەوەیە ببێت بە مرۆڤ. هەر بۆیە لەودیو قەفەسەکەیەوە، دیقەتی دەریاوانە بەدمەست و سەرخۆشەکان دەدات و بەوردی سەیری جووڵە و هەڵسوکەوتیان دەکات و دەکەوێتە لاساییکردنەوەیان. واتە خۆی فێر دەکات ببێتە مرۆڤ.

لەبەر خۆشەویستیی مرۆڤایەتی نابێتە مرۆڤ، بۆ ئەوە

دەبێتە مرۆڤ، تا ڕزگاری ببێت، بۆ ئەوەی بژی و لە مردن قوتاری بێت. بۆچی کافکا ئەم چیرۆکە تاریک و خەمناکە دەنووسێت؟ تۆ بڵێی ئەم دەقە باس لە ژیانی خۆی بکات؟ کسینگیان لە *کێوی ڕۆح*، لە ململانێدایە لەگەڵ خۆیدا.

تاوێک دەیەوێت وەک عارفە تاوییەکان لەسەر لووتکەی چیاکان پەنا بگرێت و ژیان بکات، تاوێکی دی داوای دنیا دەکات و دەیەوێت مەتبەخی مرۆڤ و ئاگری مرۆڤ و خواردنی مرۆڤی هەبێت. دەمێک دەخوازێت لە دارستانە کۆنەکاندا ون ببێت و مەحف ببێتەوە، دەمێکی دی پرکێشی دەکات و شار و هەراوزەنا و بێنەوبەردەی شارەکانی دەوێت. مرۆڤ چیی دەوێت؟ ئایا دەزانێت داوای چی دەکات؟ ئایا کەسێکی تەنهایە و هەر خۆیەتی؟ یان لە ناخیدا زیاد لە کارەکتەرێک لە ململانێی و ناکۆکییەکی بێکۆتادان؟

ململانێی نەبڕاوەی ئەو کارەکتەرە ناکۆک و دژبەیەکانە، کافکایان دووچاری سیل کرد. کسینگیان لە کێوی ڕۆحدا پێشنیاری تایبەتیی خۆی پێشکەش دەکات و دەڵێت، "گومان دەکەم لەبەر هۆکاری دەروونی دووچاری شێرپەنجەی سی هاتبم." پزیشکەکان بە تیشک وێنەی دەگرن و پەڵەیەک لەسەر سییەکانی دەر دەکەوێت. ئەبێت ئەو پەڵە سەیرە چی بێت؟ پزیشکەکان دەڵێن شێرپەنجەیە و دەمرێت. گومان لە زانست ناکرێت. ئەم پەڵەیە لەسەر سییەکانت، واتە دوای ماوەیەکی کەم دەمریت. دوای چەند ڕۆژێکی دی، وێنەیەکی سییەکانی دەگرێت؛ لەنێوان ئەو دوو وێنەیەدا، خۆی دەبینێت نوێژ دەکات. بێ ئەوەی ئاگای لە خۆی بێت، دەجووڵێن.

نویژێکی دووروودرێژ دادەبەستێت و داوای پەرجوو دەکات. لە دووەم وێنەدا، پەڵە لەسەر سییەکانی نامێنێت. پزیشکەکە دەڵێت، "شتی وا ڕوو دەدات. دەگمەنە، بەڵام ڕوو دەدات... بە هۆی سەرما و هەوکردنێکی کتوپڕ، ئەو تارمایی و پەڵانە دەر دەکەون." ساڵانێکی زۆر بەر لەوە، هەمان شت لە کافکاش ڕووی دا، بەڵام ئەو قوتاری نەبوو. بڵێی هیی ئەوە بووبێت نوێژی بیر چووبێت؟

چی کسینگیانی ڕزگار کرد؟ لە نەخۆشخانەکان هەڵدێت و ڕوو دەکاتە گوندەکان. بڕیار دەدات ژیانێکی نوێ دەست پێ بکات ژیانی نوێ لەکوێیە؟ مرۆڤ لەم سەرزەوییە، دەرفەتی دیکەی دەدرێتێ؟ چۆن لە پێستی خۆی دێتە دەرێ؟ چۆن کارەکتەری خۆی دەگۆڕێت؟ ئاخۆ شتی وا دەبێت؟

لە یەکێک لە دارستانەکاندا، جوانییەکی بێکۆتا دەبینێت. دارودرەختی وەها دەبینێ، پێشتر نەیبینیون. گوڵی سوور دەبینێت، سەرزەوییان داپۆشیوە و ڕووەو ئاسمان بەرز بوونەتەوە. لە بەردەم ئەو گوڵانەی وەک بەفر سپی دەچنەوە، هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەمژێت و هەست دەکات دەچێتە ناو بازنەی سروشتەوە و ئاوێتەی ئەو جیهانە سروشتییە دەبێت. هەناسەیەکی قووڵی دیکە هەڵدەمژێت و هەوا پاک و بێگەردە – هەوای دارستانە بەرزەکانی سەر شاخەکان – جەستەی پڕ دەبێت و تا بنی پێی دەچێت. هەست بە ئارامییەک دەکات، پێشتر هەستی پێ نەکردووە. ئازادییەک تام دەکات، کە هەرگیز نەیبینیوە.

لەو ساتەوەختە پڕنیعمەتەدا، گەردەلوولێکی سپی هەڵدەکات و جەستە و سەری لوول دەدات. گەردەلوولێکی

کتوپڕ هەڵدەکات و ون دەبێت. هاواری چاوساغێک دەکات، بەلام گەردەلوولەکە دەنگەکە لووش دەدات. ئەو خۆی دەنگی خۆی نابیستێت، ئیتر چۆن ڕێبەر و چاوساغێک دەیبیستێت؟ بەر دارودرەختەکان دەکەوێت و لە نیشانەیەک دەگەڕێت، بیخاتەوە سەر ڕێ. لەناکاو گەردەلوول نامێنێ و کسینگیان سەیر دەکات بە لێواریکەوەیە و خوارەوەشی چاڵێکی ڕەشە.

لە قووڵاییی چاڵ و دۆڵەکەشدا، ئاوی ڕووبارێکی سپی هەیە. ئەو لەسەر لێوارێک وەستاوە و هەنگاوێکی تری بنایە، مردبوو. سەیری دۆڵەکە دەکات، تەنها بەرد و دارودرەخت دەبینێت و شوێنپێی مرۆڤ بەدی ناکات. لە سەرەتای سەفەرەکەیدا خەرەندێکی بینی، کە ڕووبارێک لە دامێنیدا بوو، بەلام ئەو ڕووبارە پردێکی لەسەر بوو. لەسەروو خەرەندەکەشەوە، مالگەلێکی بینی، دووکەڵ لە لوولەی سەربانەکانیانەوە بەرز دەبووەوە. هەنووکە شوێنپێی مرۆڤ نابینێ. ئەم دۆڵە قەبز و تاریکە ژیانی مرۆڤی تێدا نابینرێت.

گەردەلوولەکە لەناکاو دەگەڕێتەوە و نووسەرەکە لوول دەدات... چی بکات؟ تۆ بڵێی ئەوە مردن بێ؟ کێ دێت و قوتاری دەکات؟ ئایا کەس ڕزگاری دەکات؟ هاوار دەکات و دەقیژێنێت، بەلام گەردەلوولەکە هەموو دەنگێک هەڵدەلووشێت. فلوبێر تەنها دەیویست بنووسێت و هیچی تر. بە هاوڕێیەکی دەڵێت، "چاکترین شت ئەوەیە، مرۆڤ بنووسێت، بەلام ئەوەی دەینووسێت، بلاوی نەکاتەوە." فێرناندۆ پێسوا وای کرد. کافکا تا لە ژیاندا بوو، شتێکی وای بلاو نەکردەوە. خەڵک دوای مردنی بە بەرهەمەکانی ئاشنا بوو. پێسوا دەیزانی فلوبێر دەڵێت چی و کافکاش لێی بەئاگا بوو.

نووسین لەپێناو ئەوانی دیدا نییە و بۆ خاتری ئەوان نییە. بۆ ئەوانە و ئەوانیش نییە. پارادۆکسی نووسینیش لێرەدایە.

مرۆڤ لە گۆشەگیری و تەنهاییدا نەبێت، نانووسێت. گۆشەگیری (گۆشەگیریی ناوەکی)، وای لێ دەکات بنووسێت. نووسین لە یەک کاتدا بەرەو گۆشەگیریی زیاتر و بەرەو تێکەڵبوون و پەیوەندیت دەبات، لەگەڵ خەڵکوخوادا. تەنانەت ئەگەر ئەوەشی دەینووسیت، بڵاوی نەکەیتەوە. نووسەر لە تەنهایی و گۆشەگیریی خۆیدا، جیهانێک دروست دەکات. جیهانێک، لێوانلێو لە مرۆڤ و ململانێ و حەز و ئارەزووی هەمەجۆر.

ئایا نووسەر کاتێک دەنووسێت، تەنها و گۆشەگیرە؟ تەنانەت گەر باس لە کەسێکیش بکات، کە لە خەڵکوخوا دوور کەوتبێتەوە؟ *ژیانی مایکڵ. ک. و سەردەمەکەی*، ڕۆمانێکە دەربارەی پیاوێک، لە خەڵک و لە شەڕ هەڵدێت. سەربوردەی پیاوێکە، لە دوورگەیەکی ئارام دەگەڕێت. کۆیتزی لە پێدەشتەکانی ئەفەریقادا، دوورگەیەک بە مایکڵ. ک. دەبەخشێت. کونێک هەڵدەدڕێت و لەو کونەدا دەژی. ئایا هەڵهاتن چارەسەرە؟ شەڕ تا کونەکەی شوێنی دەکەوێت.

دنیا وایە، ژیان وایە... فلوبێر دەیزانی وایە. دەیبینی ئەو خەڵکە لە چ هەڵبەزودابەزێکدان و دووچاری چ هەڵچوونێکی قێزەون بوون. دەیبینی ڕق و کینە و هەوەسبازی، بەسەر نوێژ و لێبووردەییدا زاڵ بوون. ئەوانەی دەبینی و هیواخواز بوو هەرگیز ناوی خۆی نەخستایەتە سەر هیچ کتێبێک. ئەو ئاواتەی لەبەر هۆکارگەلێکی تایبەتی بوو. لەودیو ئەو شتانەوە، دەیبینی ڕسوایی و سووکایەتی سەرەتاتکێیانە.

هـەر بۆیـە مەحفبوونـەوەی خـۆی بەئـاوات دەخواسـت. نووسـەر لـە تەنهایـی و گۆشـەگیریدا دەنووسـێت، بـەڵام سـەروەختێک دەنووسـێت، خـۆی لـە ناوجەرگـەی دنیـادا دەبینێت.

سـەروەختێک بەسـەر لێوارەکـەوە وەسـتاوە، گەردەلوولێک هەڵـدەکات و دەیپێچێتـەوە. دەقیژێنـێ و داوای پەرجوویـەک دەکات. دەبێـت ئـەو پەرجـووە چـی بێـت؟ لـە ژیانیـدا چیـی کردووە؟ بەدرێژاییی ژیانی هـاوار دەکات و دەقیژێنێ، تـا بێن بەدەمیـەوە و ڕزگاری بکـەن. لـەو گەردەلوولـە قوتـاری بکـەن. گەردەلـوول چـاو کوێر دەکات. چاوەکانی پڕتاریکی دەکـەن، لـە کاتێکدا ئـەم داوا دەکات ببینـێ و خـۆی لـە گەندەڵـی بپارێزێ. خـۆی لـە کوێربوونێک لا بدات، کـە وەک پەتـا بـڵاو دەبێتـەوە. بەکورتـی، نایەوێت جیهـان چاوانـی پـڕ بکات لـە تاریکی.

ئەمـە ململانێی کسـینگیانە. شـوورای چیـن قورسـە لەسـەر دڵـی، بۆیـە دوور دەڕوات. هەڵدێت بـەرەو دارسـتانەکان و ڕوو دەکاتـە شـاخەکان، بەڵام ناتوانێت ببێتـە عارفێک. ناتوانێت ببێتە عـارف، لەبـەر ئـەوەی نووسـەرە و لەبـەر ئـەوەی کۆمەڵگـەی مرۆڤایەتـی تـا هەنووکـەش فریـوی دەدات. ئـەو عـارف نییـە. قەشـە سـرگیۆس نییـە، تۆلسـتۆی نییـە.

کاواباتـا لـە وتارەکەیـدا لـە بـەردەم ئەکادیمیـای هنـویدیدا، بـاس لـە عارفـە بودایییـەکان دەکات. ئـەو عارفانـەی چامـەی شـیعری دەنووسـن و بـاس لـە مانـگ دەکـەن لـە ئاسـمان. باسـی ڕەشـەبا دەکـەن لـە نیوەی شـەودا. بـاس لـە گوڵـی سـپی دەکـەن. لـە گـەڵای لوتـس، کاتێـک سـەر ڕووی ئـاو دەکەوێت. کاواباتـا لەگـەڵ ئـەو شـاعیرە عارفانـەدا تەماهـی دەکات و بـاس

لە نووسەرێک دەکات، خۆی کوشتووە. کاواباتا پێی وایە، ئەو کەسە بۆیە خۆی کوشتووە، لەبەر ئەوەی چیی تر نەیتوانیوە وەک جاران سەیری مانگ و جوانییەکانی مانگ بکات. کاواباتا ئەوکات نەیدەزانی بە ماوەیەکی کەم دوای ئەوە، ئەویش بە گاز خۆی دەکوژێت.

مرۆڤ تەنها یەک کەس نییە، بەڵکوو لە ناخیدا ژمارەیەکی بێشوومار لە کارەکتەر دەستەویەخەن و لە ململانێدان. کاتی وا هەیە مرۆڤ بەهێزە و خۆڕاگرە، کەچی چرکەساتێکی ڕەش دێت و دەکەوێت. کەسمان دەزانین داهاتوو چیی پەنهان داوە؟ هۆمیرۆس نایەوێت لەگەڵ خواکانی شیعر و سروودا دەستەویەخە ببێت و پرکێشیی وا بکات. هەر دێڕێک کە دەینووسێ، دەپاڕێتەوە و داوای یارمەتی لە ئاسمان دەکات. لە کاتی ڕەش و تاریک دەترسێت. لە سەرەتاکانی *ئەلیادە*دا باس لە شاعیرێک دەکات، ئامبازی ئاسمان دەبێت و ئاسمانیش تارەکەی تێک دەشکێنێت و چاوی کوێر دەکات و زمانی لە گۆ دەخات.

هۆمیرۆس لە چی دەترسێت؟ ئەم ترسە بەردەوامە بۆچی؟ تۆڵستۆی لە ڕۆژانەکانیدا، بەگژ لووتبەرزی و خودپەسەندی و لە خۆباییبووندا دەچێتەوە. بەگژ ئەو شتانەدا دەچێتەوە و داوای ئارامی دەکات. داوای چی دەکات؟ ئاشتی، داوای ئاشتی دەکات و درێژە بە نووسین دەدات. سەرفرازی و ڕزگاربوون، تەنها لە نووسیندا دەبینێت. ئاخۆ سەرفرازی و قوتاربوونی دەستگیر دەبێت؟ نووسەر لە کتێبدا دەتوێتەوە و ون دەبێت!

# نووسەر و دونیا

ئایا هیچ نووسەرێک دەتوانێت بنووسێت، بەبێ ئەوەی ئەو شتانەی دەیاننووسێت، بڵاویان بکاتەوە؟ بنووسێت و پاشان هەرچیی نووسیوە، لە سندوقێکی تەختەدا و لەپاڵ پێخەفەکەیدا بیشارێتەوە؟ فێرناندۆ پێسوا وای کرد. چەند ساڵێک دوای مردنی، پیاوێک دێت و سندوقێکی فەرامۆشکراو و داخراو دەکاتەوە. لاپەڕە نووسراوەکانی ناو سندوقەکە دەخوێنێتەوە و دەست دەکات بە بڵاوکردنەوەیان. لە زمانی پورتوگالییەوە کتێبی *نائارامیی* بۆ زمانەکانی دی وەر دەگێڕدرێت.

بیرەوەرییەکانی پێسوا، بیرەوەری نین. کتێبەکەی، کتێبێکی ئاسایی نییە. جار لەدوای جار دەیخوێنێتەوە، وەک ئەوەی دنیا زیرەکێکی ورد و کەموێنە دیقەتی لێ بگرێت. جیهان وەک ئەوەی زمانێکی نائاسایی بینووسێتەوە و شیعر بگەیەنێتە ئاستی تۆکمەییی زانست. شرۆڤەکردنی هەستەکان و وەسفکردنی، پەیوەندیی بە کاتەوە، بە هەور و بە مرۆڤ و بە شتەکانەوە. باسکردنی ئەوەی ڕووی داوە و ئەوەی

ڕوو دەدات. ئەناتۆمیکردنـی خەمۆکـی.

کـە پێسـوا بەئینگلیـزی دەخوێنێتـەوە، هەسـت دەکەیـت جیهان بـە بەرگێکی نوێوە دەبینێت. وشـەکان بە بەرچاوماندا ڕەت دەبـن، وەک دڵۆپەئـاو بـە چاوانماندا دێنـە خـوار و لـە ناخمانـدا ئۆقـرە دەگـرن. بەدەگمـەن نەبێت، ئەمـە ڕوو نـادات. پیاوێک توانـای ئـەو هەمـوو بینین و قووڵبونـەوە و دیقەتدانـەی هەبێت و زمانێکیشـی هەبێت بـۆ تۆمارکـردن و کەشـفکردنی هەمـوو ئـەو شـتانە. ئایـا کەسـمان زمانمـان پـێ عەتـا دەکرێت بەبـێ دنیابینـی؟ ئـەی هەیـە دنیابینیی پـێ بدرێت بەبـێ زمـان، یاخـود دنیابینـی و زمـان ئاوێتـەی یەکـن و لـە یەکـدی جیـا نابنـەوە؟

مرۆڤ تەنهـا خـۆی دەنووسـێتەوە و جگـە لـە نووسینەوەی خـۆی، هیچـی تـر نـاکات. هۆمیـرۆس جیهانـی نووسـییەوە. جیهانـی لەنـاو خۆیـدا نووسـییەوە. شـۆپنهاوەر درکـی بەمـە کـرد. ئایـا نووسـەر کـە دەنووسـێت، لـە ناوجەرگـەی دنیـادا نیشـتەجێیە، یـان لـە دەرەوەیـدا؟ سـەروەختێک سـتیڤنسـەن وەسـفی شـەقامەکانی لەندەنـی دەکـرد لـە شـەودا، باسـی لـە گڵۆپـی سەرشـەقامەکان و زریـان و ڕەشـەباکانی دەکـرد، کـە بـەر پەنجـەرەی ماڵـەکان دەکەوتـن، لـە لەنـدەن بـوو یـان لـە جێگەیەکـی دی؟ سـەروەختێک بەخێرایـی وشـەکانی لەسـەر لاپەڕەکانـی بەردەسـتی تۆمـار دەکـرد، پیاوێکـی سیماشـێواوی دەبینـی، وەک ئاژەڵێکـی زل و قەبـە هەنـگاو دەنـێ و پـێ بەسـەر کچێکـی منداڵـدا دەنێت.

دەبینێت زریـان و تەمومژێکـی زەرد، ئـەو پیـاوە لـە چـاو ون

دەکەن. ت. س. ئەلیۆت بە چەند سەدەیەک دوای ستیڤنسەن، هەمان زریان و تەمومژی بینی. کاتێک دەربارەی پیاوێک دەینووسی، پایپێکی بە دەمەوەیە و لە ژوورێکی داخرawadا دێت و دەچێت. هەردوو نووسەرەکە، لەسەر لێوارێکی تەمومژاویی نێوان دوو جیهان نووسییان، جیهانی لەندەن و جیهانێکی دیکەی تەمومژاوی و پڕتەلیسم. لەندەن بریتییە لە دەرەوە، بەڵام کاتێک تۆ دەنووسیت، دەرەوە نامێنێت. کە دەنووسیت، بە ناخی خۆتدا ڕۆ دەچیت، لە جیهانی ناوەوەدا ون دەبیت. یاساکانی نازانیت، بەڵام بە هەستەکانت دەزانیت بوونی هەیە. تۆ بڵێی ئەوە وەهم و خەیاڵپلاو بێت؟

فێرناندۆ پێسوا باس لە گۆل و زەلکاو دەکات لە ناخی خۆیدا، وەک ئەوەی گوێی لە دەنگی بۆقگەلێک بێت، لە خامۆشیی شەودا دەقیڕێنن. ئەو لەو کاتەدا لە بەردەم پەنجەرەی ژوورەکەیدا دانیشتووە و سەیری ڕووبارەکە دەکات، وەک ئەوەی لە تابلۆیەکی زەیتیدا بێت. لە ماوەی ژیانیدا، ستیڤنسەن زیاد لە جارێک دووکەرت بووە. کافکاش بە هەمان شێوە. سەروەختێک لە بەرواری ٤ی ئەیلوولی ١٩١٧دا، دکتۆرەکان پێیان وت سییەکانت نەخۆشن، چاوی نەوی کرد و کەوتە دیقەتدانی پەنجەکانی. بەردەوام لە شەڕدا بوو لەگەڵ خۆیدا. لە ناخیدا زیاد لە کارەکتەرێک، کە لە ژماردن نایەن، لە شەڕدا بوون لەگەڵ یەکدی. ئەوە تازە بەر سییەکانی کەوتووە و لەتلەت و پارەپارە بووە. شەوان هەڵدەسێت و قوڕگی پڕە، نەک لە وشە، بەڵکوو لە خوێن. تف دەکاتە ناو دەستتشۆرەکە و شقارتەیەک

دادەگیرسێنێت و پەڵەخوێنەکان دەبینێ... هیچی ناوێت، تەنها دەیەوێت بنووسێت، بەڵام کات لەکوێ بێنێت؟

دنیا داوای شتگەلێکی لێ دەکات و ئەویش هێشتا فێر نەبووە، چۆن مامەڵە لەگەڵ دنیادا بکات... تۆ بڵێی ڕۆژێک فێر ببێت؟ ڕەنگە نهێنیی ئەو لێرەدا بێت (کە نایەوێت فێر ببێت). ترسی ئەوەی هەیە، ئەگەر لەگەڵ دنیادا ڕاهات، ئیتر ئەوە لە خۆی و لە شووناسی و لە خەون و خولیاکانی بکات. ئەو ئەگەر فێر بوو سەودا لەگەڵ دنیادا بکات، دنیا دەباتەوە و نووسین دەدۆڕێنێت، بەڵام ئەو نایەوێت نووسین لەدەست بدات. چونکە پێی وایە، ئەرکی ئەو لەسەر زەوی، ئەوەیە بنووسێت. ئەگەر نرخی ئەو کارەش زۆر گران بێت، قەیدی نییە.

ئەوەی بەو عەتا کرابوو، بە کەس نەدرابوو. ئەوەی پێ عەتا کرابوو، دنیا بە چاوی خۆی ببینێ. ئەوەی پێ درابوو، جەستەی وەک کتێب بکاتەوە و هەموو دنیا قووت بدات. ئاسمان لە ناخیدا مەلە دەکات و هەورەکانیش دوور دەکەونەوە. شەمەندەفەر و کەشتی و شارگەلێک، کێڵگە و گوند و مرۆڤ. هەموو ئەمانە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەڕۆن. هاوسەرگیری دەکەن و دەژین و پاشان مەرگ زەفەریان پێ دەبات. هەموو ئەمانە لە ناخی کافکادان. شەو و ڕۆژ چاودێرییان دەکات و ئاگای لێیانە، لە کاتی خەوتن و بەئاگاییدا دەیانبینێت. بێ ئەوەی بزانێت لەکوێوە دێن، وێنەگەلێک بە مێشکیدا دێن و شەقام و ژوورەکانی پڕ دەکەن. ئەمەیە جیهان و جیهان ئەمەیە.

دریتیش کاتێک گوێبیستی حیکایەت و بەسەرهاتی پیرەمێردەکان دەبوو یان مێژووی دەخوێندەوە، دنیای دەبینی. بێ ئەوەی بە خۆی بزانێت، سەربووردەی ژیانی تۆڵستۆی دووبارە دەکردەوە. ئایا دانتی سەروەختێک دەربارەی *دۆزەخ* دەینووسی، جیهانی دەنووسییەوە؟ چەند دیمەن و تابلۆیەک لە (ئۆدیسە) دەخوازێت، هەرچەندە هۆمیرۆسی نەخوێندۆتەوە. لە ڕێی خوێندنەوەی ڤێرجیلەوە هۆمیرۆسی ناسی. بازۆڕییەک لە برینداریک نزیک دەبێتەوە، کە لەسەر پشت کەوتووە.

ئایا ئەوە بازۆڕییە یان قەلەڕەش یاخود هەڵۆ؟ پیاوەکە بە دوو چاوی شەکەت و ماندووەوە دەبینێت، بەڵام ئەو دەنووک لە جگەر و توورەگەی خوێن وەر دەدات. ئەم وێنەیە لەکوێوە دێت و لە کێوە سەرچاوە دەگرێت؟ بەر لە هەرکەس، سەرچاوەکەی هۆمیرۆسە. پاشان لە خوارەوە دێت، واتە لە سەفەر بەرەو مەملەکەتی مردووانەوە دێت. نووسەرێک، چەند سەدەیەک دوای خاوەنی *ئەلیادە* دێتە ئەم دنیایە، هەمان وێنە دەبینێت و دەینووسێتەوە، بێ ئەوەی بزانێت ئەوە پێشتر نووسراوە. پێکداچوون و ئاوێزانبوونی نێوان دەقەکان هێندە زۆرە، ئەژمار ناکرێت. ئەم پرۆسەیەش هەر بەردەوامە و مایەی سەرسووڕمانە.

ئاخۆ بۆرخیس دیقەتی ئەوەی داوە، ئەژدیها لە خەیاڵدانی خۆرهەڵاتدا (بۆ نموونە چین)، هاوشێوەی ئەژدیهای ئەورووپا و خۆرئاوایە. یەک فۆرمی خەیاڵی لە دوو خەیاڵدانی کۆندا دروست دەبێت، دوو خەیاڵدان، کە پێدەشت و دەریا و

دیوارگەلێکی زۆر لەنێوانیانداییە... ئایا ئەمە چۆن دەبێت؟ نووسەر لە جیهاندا دەژی، بەڵام ساتەوەختێک دەنووسێت، بەرەو دەرەوەی جیهان دەڕوات. لە پنتێکی خەیاڵیدا دادەکوترێت، ئەوکات وەک مەلەوانێکی ناو دەریا، وێنە و وشەی بێشوومار دەبینێ. شەپۆلەکان هەڵدەچن و دادەچن. نووسەر سەعاتێک دەژی و دەپارێتەوە، کە ئەو سەعاتە بەردەوام ببێت و کۆتایی نەیەت.

# نووسەر و بابوباپیرانی

ئایا نووسەر دەزانێت باوانی کێن؟ دەزانێت ئەو نووسەرانە کامانەن، کە دنیابینی و ستایل و ڕوانگەی ئەوەیان پێ بەخشیوە، تا سەیری زمان و دنیای پێ بکات؟ ئەدەب لاساییکردنەوەیە، داهێنان و ئافراندن نییە. ئەدەب کەلەپوورە. هەر زوو ت. س. ئەلۆت ئەوەی زانی. بۆرخیس باس لەوە دەکات، کە لە هەموو ژیانیدا، لە کتێبخانەکەی باوکی (کتێبخانەی منداڵی) نەچۆتە دەر.

کافکا جار لەدوای جار ئەوەندە ئەو کتێبانەی خوێندەوە، کە دڵخوازی خۆی بوون، هەتا لاپەڕە زەردەکانیان لەنێوان پەنجە بنێس و باریکەکانیدا هەڵوەرین. دانتی تا سروودەکانی ڤێرجیلی لەبەر نەکرد، دانەبەزییە ژێر زەوی. دانتی هۆمیرۆسی نەخوێندەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، هۆمیرۆس بە یەکێک لە باوانی ئەو ئەژمار دەکرێت.

دانتی کاتێک ڤێرجیلی دەخوێندەوە، سەرسام بوو بە هۆمیرۆس. جورجی زێدان جارێکیان نووسیبووی، ڤێرجیل سەرلەبەری *ئەنیادەی* لە ئۆدیسەی هۆمیرۆس وەر گرتووە.

جورجی زێدان منداڵی ساحة البرج بوو لە بەیروت، بەڵام دواتر دەریای بڕی و گەیشتە میسر و بوو بە میسرییەکی سەیروسەمەرە. داستانەکەی ڤێرجیل بە ئەنیادە ناو دەبات، نەک ئەلیادە. ئەمە هەڵەی چاپە، ئەگینا هیچ جیاوازییەک لەنێوان ئەنیادە و ئەلیادەدا نییە. هەروەها جیاوازی لەنێوان داستانەکەی هۆمیرۆس و داستانەکەی ڤێرجیلدا نییە (وەکوو جورجی زێدان باسی دەکات)، بەڵام نە ڤێرجیل هۆمیرۆسە و نە دانتییش ڤێرجیلە.

*کافکا و باپوباپیرانی*، ناوونیشانی وتارێکی خۆرخە لویس بۆرخیسە. لەو وتارەدا بۆرخیس دەڵێت، "باب و باپیرانی کافکا، دروستکراوی دەستی کافکا خۆیەتی." زینۆنی ئەیلی، کە خاڵی (أ) جێ دێڵێ و هەرگیز ناگاتە خاڵی (ب)، یەکەمین کارەکتەری کافکاوییە لە مێژووی ئەدەبدا. لە پارادۆکسەکانی زەینونی ئەیلیدا، جووڵە مەحاڵە. تۆ ناتوانیت لە (أ) بچیت بۆ (ب)، لەبەر ئەوەی پێش ئەوە دەبێت نیوەی ئەو ماوەیە ببڕیت و بەر لەوەش نیوەی ئەو نیوەیەت بڕیبێت، بەم جۆرە ئەمە درێژ دەبێتەوە تا دوایی.

ئەی ئــــەمە لە کارەکتەری سەرەکیی ڕۆمانی *قەڵا* ناقەومێت؟ ئەی ئاخۆ ئەمە نهێنیی پەیامی ئیمپراتۆری نییە؟ یاخود ئەم پارادۆکسە خولقێنەری *پزیشکی گوند* نییە؟ ئەمە خاڵی هاوبەشی نێوان بەرهەمە ئەدەبییەکانی کافکایە (دەستەوستانی مرۆڤ لە گەیشتن بە ئامانج، بەڵام ئاخۆ ئامانج هەیە؟) تاریکستانی کافکا چینچینە. بۆرخیس لە

وتــــارەکەیدا بـاس لەمـە نـاکات، بـەلام سـەروەختێک دەڵێت، "کـــافکا خـۆی بابوباپیرانـی خـۆی خوڵقانـدووە" پەراوێزێـک دادەنێت، لە پەراوێزەکەدا ناوی ئەلیۆت دەخوێنینەوە. درێژە بە خوێندنـەوە دەدەین، لەبـەر ئـەوەی نـاوەڕۆک لـە پەراوێـز گرنگتـرە.

کافکا خـۆی باوانـی دروسـت دەکات، چونـــکە ئێمـە بەبێ کافـکا لـە پارادۆکسـەکەی زینۆنـی ئەیلیـدا، نهێنیـی کافـکا نابینیـن. بـەر لـەوەی کـــافکا پەیـدا ببێـت، بـە جۆرێـک لـە پارادۆکسـەکەی زینونی ئەیلی تێدەگەیشتین و ئێستاش دوای خوێندنـەوەی کافـکا، بـە جۆرێکـی دی لێـی حاڵـی دەبیـن.

*هـەزار و یـەک شـەوە* بـەر لـە خوێندنـەوەی بۆرخیـس، هەمـان ئەو کتێبە نییە دوای خوێندنەوەی ئـەو. هـەزار و یـەک شـەوە بـەر لـە وەرگێڕانەکانـی گالان و بیرتـۆن و لایـن، ئـەو هـەزار و یـەک شـەوەیە نییـە، کـە ئێسـتا دەیخوێنینـەوە.

بۆرخیـس فرتوفێڵـی خـۆی هەیـە و لـە پەراوێـزدا نـاوی ت. س. ئەلیـۆت دێنـێ. ئەگـەر نەگەڕێینـەوە لای ئەلیـۆت و نەیخوێنینـەوە، هەسـت ناکەین خاوەنـی *وێرانە خاک*، دە سـاڵ بـەر لـە بۆرخیـس ئـەو قسـەیەی کـردووە. بۆرخیـس وتـاری کافـکا و باوانیـی لـە سـاڵی ١٩٥١دا نووسـی، بـەلام لـە سـاڵی ١٩٤١دا ئەلیۆت وتارێـک دەربـارەی *ئـەدەب و لاسـاییکردنەوە* دەنووسـێت و لەوێـدا بـاس لـەوە دەکات، کـە (هەمـوو نووســەرێک باوانـی خـۆی دروسـت دەکات). هـەر نووسـەرە باوانـی خـۆی دیـاری دەکات، چونکـە هەمـوو تێکسـتێکی نـوێ،

ستایلی خوێندنەوەی ئەو دەقەی پێش خۆی دەگۆڕێت. بەم پێیە، دەقەکەش دەگۆڕێت. هەر بۆیە کتێبەکان بەردەوام دەگۆڕێن.

کتێب تەنها یەک کتێب نییە، بەڵکوو ژمارەیەک کتێبی ناکۆتایە. ئیبن عەرەبی سەروەختێک *فتوحاتی مەکیی* دەنووسی، درکی بەمە کردبوو. بۆرخیس ماوەیەکی زۆر بەر لەوەی *کتێبی لم* بنووسێت، ئەوەی دەزانی. ئەم کورتەچیرۆکە، کە بۆرخیس لە دوا ساڵەکانی ژیانیدا نووسیی، لە پەراوێزی چیرۆکێکی کۆنیدا لەدایک دەبێت، کە لە سەرەتای ژیانیدا نووسیویەتی.

لە یەکێک لە پەراوێزەکانی *کتێبخانەی بابل*دا، هەواڵی کتێبێک دەخوێنینەوە، لانی کەم دوای نیوسەدە دەبێتە کتێبی لم. یاقوتی حەمەوی لە ئیبن فەزلان شت وەر دەگرێت و زەکەریای قەزوینیش لە ئەبو حامدی ئەندەلوسی. ئیتالۆ کالڤینۆ جارێک لە دیالۆگدایە لەگەڵ داستانی *ئۆرلاندۆی شێتگیر* لە سیینەکەیدا بە ناوی *پێشینان*، جارێکی دیکەش مشتومڕ لەگەڵ مارکۆ پۆلۆ دەکات لە *شارە نەبینراوەکان*دا.

شارە نەبینراوەکانی کالڤینۆ، بەرهەمی خوێندنەوەی مارکۆ پۆلۆیە. ئەدەب لە خوێندنەوەوە سەر دەر دێنێ. ئەلیۆت دەڵێت چی؟ دەڵێت ئەدەب لاساییکردنەوەیە. ئەمە ڕاستە، بەڵام لاساییکردنەوەیەک، لێوانلێو لە خەیاڵ و فانتازیا. گەر یەکێک لە ئێمە بیەوێت لەمڕۆدا *دۆن کیشۆت* بنووسێت، ئەوا کتێبێکی تازە دەنووسێتو کە ناچێتەوە

سەر دۆن کیشۆتی یەکەم، تەنانەت ئەگەر دێڕبەدێڕیشی کۆپی بکات. بیارمینارد وای کرد. خوێنەری دۆن کیشۆت لەمڕۆدا شتگەلێک لەو دەقەدا دەبینێت، کە خوێنەری هەمان ڕۆمان لە ئیسپانیای سەدەی حەڤدەهەمدا درکی پێ نەکردووە.

ئەدەب، ساڵ لەدوای ساڵ دەگۆڕێت. شارە نەبینراوەکانی ئیتالۆ کالڤینیۆ، سەر بە سەدەی بیستەمە، لەبەر ئەوەی نووسەرەکەی کوڕی ئەو سەدەیەیە. نووسەرێکی هەستناسک و پەژمووردە، دەربارەی شارە کۆن و دێرینەکانی مارکۆ پۆلۆ دەخوێنێتەوە و هەست دەکات لە ناخیدا شارگەلێک هەن، هاوشێوەی ئەو شارانەن.

مسیۆ پالۆمار هەراوزەنای ڕۆما و بۆنوبەرام و کێبڵ و وایەری کارەبا ڕای دەچڵەکێنن. وەک مارکۆ ڤالدۆ قارچکێکی کێوی دەخوات و ژەهراوی دەبێت. تەنانەت بێ ئەوەی کەروێشکێک بخوات، کە لە تاقیگە هاتۆتە دەر، نەخۆش دەکەوێت. وێنەی شارە نوێیەکان و وێنەی پڕ لە هەراوزەنای جیهانی مۆدێرن، وێنەی ئەو خەڵکە زۆر و بێشوومارەی ناو باڵاخانە و ئاپارتمانەکان، بەسن بۆ ئەوەی ژەهر و ترس بکەنە خوێنیەوە. ئەو کاتێک بە ڕێدا دەڕوات، خوێن لە جەستەیدا ژەهراوی دەبێت.

دەیەوێت هەڵبێت و ڕابکات، بەڵام بۆ کوێ؟ هەڵبێت بەرەو چین و جیهانە فانتازییەکەی مارکۆ پۆلۆ، بەڵام لەوێش تەنها شاری مۆدێرن دەبینێت. شار حاڵەتێکی

دەروونییە. مارکۆ پۆلۆش بەدوای شارەکەی خۆیدا دەگەڕا، لەو ڤینیسیایە دەگەڕا، کە سەر ئاو کەوتووە. تەنانەت ئەو کاتانەشی وەسفی کاتای و کین سای و شارەکانی دیکەی چینی دەکرد، مەبەستی ڤینیسیا بوو. فرانسیس ود دەڵێت، "هەرگیز مارکۆ پۆلۆ نەچۆتە چین." تۆ بڵێی مارکۆ پۆلۆ ئەو کتێبەی دەربارەی چین و شارە فانتازی و واقیعییەکانی لە ئیستانبوڵ نووسیبێت. لە خانوویەکی بچووکی شاری ئیستانبوڵدا، کە پڕی کتێب بووبێت، دانیشتبێت و ئەو کتێبەی نووسیبێت.

سێرڤانتس باسی لەوە دەکرد، ڕۆمانەکەی لە دەستنووسێکی عەرەبییەوە وەر گرتووە، ئەو دەستنووسەشی لە یەکێک لە بازەڕەکانی شاری گلیگەدا دۆزیوەتەوە. دەستنووسەکە دەبات و لە عەرەبییەوە دەیکات بە ئیسپانی و هەندێ شتی بۆ زیاد دەکات. ئەم کارەی سێرڤانتس لە سەدەی نۆزدەهەمدا، دەبێت بە هەقیقەتێکی سەیروسەمەرە. کاتێک کەسێک هەزار و یەک شەوە وەر دەگێڕێت و باس لەوە دەکات، کە لە دەستنووسێکی تونسییەوە ئەو کارەی کردووە. ئەو وەرگێڕە ویستوویەتی وەرگێڕانێکی تازە پێشکەش بکات، جیاواز بێت لە وەرگێڕانەکانی گالان بیرتۆن و ئەوانی دیکە.

بۆچی ئەو پیاوە باس لەوە دەکات، کە هەمان ئەو کتێبە عەرەبییە، لە دەستنووسێکی خەیاڵیی تونسییەوە وەر دەگێڕێت؟

لە دەیەی یەکەمی سەدەی هەژدەهەمدا، گالان دەستی کرد بە وەرگێڕانی هەزار و یەک شەوە بۆ زمانی فەرەنسی. کتێبەکە لە دوازدە بەرگدا چاپ کرا (دوایین بەرگ دوای مەرگی گالان، ڕووناکیی بینی) و بەمەش *شەوانی عەرەبی* گەیشتە هەموو جێیەک. گالان لەگەڵ دەستنووسی هەزار و یەک شەوەشدا، چەندین چیرۆک و بەسەرهاتی دیکەی وەر گێڕاوە و دەڵێت، "ئەو چیرۆکانە مارۆنییەکی خەڵکی شاری حەلەب بۆی وەر گێڕاوم، کەسەکەش ناوی حەنایە."

تۆ بڵێی حەنای حەلەبیی مارۆنی کارەکتەرێکی هەقیقی بووبێت؟ ئایا هەر بەڕاست گالان چیرۆکی *عەلادین* و چیرۆکی *عەلی بابای* لە زمانی حەنای حەلەبیی مارۆنییەوە بیستووە، یاخود حەنا خۆیشی حیکایەتێکی خەیاڵییە؟ بۆرخیس ئەم پرسیارە ناکات. *ئینسایکلۆپیدیای ئیسلام* پڕیەتی لە ناوی ئەو نووسەرانەی هەزار و یەک شەوە یان وەر گێڕاوە بۆ زمانەکانی خۆیان.

بۆرخیس ئەم ناوانە دەزانێت، بەڵام لە وتارەکەیدا دەربارەی وەرگێڕەکانی هەزار و یەک شەوە، ناوی هەموویان ناهێنێت. هەموو ئەوانە باوانی بۆرخیسن. هەزار و یەک شەوە زیاد لە یەک کتێبە. ئەو ئەرژەنتینییە نابینایە، نابینا نەما دوای ئەوەی ئەو وتارەی نووسی، چونکە لەو وتارەدا بیرتۆن و دیمەشق، گالان و ئیستانبوڵ، لاین و قاهیرە، پێکەوە گرێ دەدات.

هەریەک لەوانە، هەزار و یەک شەوەیان لە شوێنێکی

شێوە خەیاڵیدا (لە شارێکدا دەکەوێتە ئەم بەشەی دنیا)، دۆزیوەتەوە. بۆرخیس کوڕی شارێکی دووری وەک بۆینس ئایرسە و لە تەمەنی گەنجێتیدا نەهاتووە بۆ وڵاتانی ئێمە. لە حەلەب و شام و قاهیرەدا دەستنووسی عەرەبیی چنگ نەکەوتووە. هەزار و یەک شەوەی بە زمانی ئینگلیزی لە کتێبخانەکەی باوکیدا، لە گەڕەکێکی بۆینس ئایرسدا بینیوە.

ڕوسیاش ناوی کریمسکی ناهێنێت، هەرچەندە کریمسکی لە ئینسایکلۆپیدیای ئیسلامدا ناوی دێت. ئەم پیاوە، لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا لە بەیروت ژیاوە، ئەویش بە هەمان شێوە هەزار و یەک شەوە سەراسیمەی دەکات. کریمسکی وەکوو بیرتۆن و لاین و گالان و کەسانی دی، لەو چیرۆک و بەسەرهاتە فانتازییانەدا، جیهانێکی تەواویان دەبینی.

شەهرەزاد کێ بوو؟ ئەی کێ هەزار و یەک شەوەی نووسیوە؟

مارکیز لە سەد ساڵ تەنیاییدا، باس لە هەزار و یەک شەوە دەکات. تێکڕای نووسەرانی ئەمەریکای لاتین کە باس لە هەزار و یەک شەوە دەکەن، لەگەڵیشیدا ناوی بۆرخیس دێنن.

گالان لە سەدەی هەژدەدا گیانێکی تازەی کردەوە بەبەر ئەو کتێبەدا. بیرتۆن لە سەدەی نۆزدەهەمدا هەمان شتی کرد. ئەم کابرا ئینگلیزیە، کە بەڕووپۆشکراوی ڕووی کردە مەککە و هەزار و یەک شەوەی لە شازدە بەرگدا وەر گێڕا،

بەو کارەی بوو بە یەکێک لە باوانی بۆرخیس. بۆرخیسیش بوو بە چاوساغی ئەمەریکای لاتین و جیهان بۆ هەزار و یەک شەوەی بیرتۆن.

شەهرەیار لەکوێ ژیاوە؟ خەڵکی "د" نەبوو، خەڵکی قاهیرەش نەبوو. لە ئەسفەهان و سەمەرقەند نەژیاوە. شەهرەیار وەک ئەوەی لاپەڕەی یەکەمی هەزار و یەک شەوە باسی دەکات، پادشا بووە لە هەرێمی هیند و چین، لە خۆرهەلاتی دوور پادشا بووە.

شەهرەزاد حیکایەتی بۆ دەگێڕێتەوە و لەناو ئەم حیکایەتانەدا، حیکایەتخوانی تر دەر دەکەون و ئەوانیش قسە دەکەن. وشەکان بەرەو جیهانی فانتازیی دەبەن، دەیبەن بەرەو بەغداد و شام و قاهیرە. لەو کتێبەدا، ناوی شوێنگەلێکی بێشوومار دێت. کۆچ و سەفەرێکی زۆر ڕوو دەدات. هەموو ئەو شتانەش لە ژوورێکدا ڕوو دەدەن، کە شەهرەیار و هاوسەرەکەی تێدان. لە یەکێک لە هەرێمە دوورەکان، لە دەریاکانی هیند و چیندا. ئەوانە باوانی ئێمەشن. تا ئەم کاتەش بوونەوەری فانتازی، کار لە خۆمان و لە ڕۆمانەکانمان دەکەن.

ئایا نووسەر باوانی خۆی دروست دەکات؟ ئەو کەسەی جار لەدوای جار و ساڵ لەدوای ساڵ هۆمیرۆس دەخوێنێتەوە، نابێت بە هۆمیرۆس؟ بەدەم خەوەوە چەند دێرە شیعرێکی ئەلیادە بەئینگلیزی دەڵێتەوە، کە ڕۆبەرت فیتزجیراڵد وەری گێڕاوە.

هۆمیرۆسی یۆنانی لە ناخیدا دەژی، وەک شاعیرێکی ئینگلیزی، کە خاوەنی وشەی بەپێز و خەیاڵێکی بەرفراوانە. نووسەر باوانی خۆی دروست دەکات، کاتێک ئەوان دروستی دەکەن. ئەوەندە ستیڤنسۆن دەخوێنێتەوە تا لەبەری دەکەیت و دەبێت بە پارچەیەک لە جەستەت. هەستی پێ دەکەیت، کاتێک لە شەودا بە ڕێوبانی شارەکەتدا گوزەر دەکەیت.

لە ناختدا لەسەر کورسییەکی ڕازێن دادەنیشێت و پایپ دەکێشێت. چی دەخوێنێتەوە؟ *دانپێدانانەکانی مارکۆس ئۆریلیۆس* دەخوێنێتەوە. ئایا نووسەر بابوباپیرانی خۆی دەناسێت؟

## بەهای نووسەر/ نێوبانگی نووسەر

بەهای نووسەر، شۆرەت و ناوبانگی دیاری ناکات. بەهای نووسەر، ئیشکردنی دیاری دەکات. ئەوە دیاری دەکات، کە نووسیویەتی و بەرهەمی هێناوە. ئەمە ئەگەرچی ڕاستییەکی زۆر سادەیە، کەچی نەک تەنها ئەمڕۆ، بەڵکوو لە هەموو سەردەمێکدا ئافەرۆز دەکرێت و پشتگوێ دەخرێت. بەڵام ئەوەی لە سەردەمی ئێستاماندا مایەی دڵتەنگییە، هەژمارونی زۆر و بێشوماری میدیایە، ئەو ئاقاری بەرخۆریەیە، کە هەیە. لەم فەزایەدا، هەموو نووسەرێک دەبێتە شمەک و ئەو شمەکەشی زۆر ڕەواجی دەبێت، ئەوەیە بتوانێت بە چاکترین شێوە خۆی نمایش بکات و بازاڕ بۆ خۆی پەیدا بکات.

خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەکانی ئەورووپا و ئەمەریکا، لە هەر گرێبەستێکی یاساییدا کە لەگەڵ نووسەرێکدا واژۆی بکەن، بۆ بڵاوکردنەوە و چاپکردنی بەرهەمەکانی، مەرجی ڕیکلامکردنی بەسەردا دەسەپێنن. بۆ نموونە، پێویستە لەسەر نووسەرەکە، واژۆ لەسەر کتێبەکەی بکات و دیدار لەگەڵ ڕۆژنامەنووساندا ساز بکات و سەردانی خوێندنگە

و زانکۆکان بکات و لە تەلەڤزیۆنیش دەر بکەوێت... هەموو ئەمانەش بۆ ڕەواجپەیداکردن و بڵاوبوونەوە و دەسکەوتی قازانج و گەیشتن بە زۆرترین ڕێژەی خوێنەران، کارێکی پێویست و گرنگن.

واتە چاپ و بڵاوکردنەوەی کتێب، بزنسێکی تەواوە. لێرەدا مەبەستی ئەم وتارە، ئەوە نییە باس لەو پرسە بکات. مەبەستی ئێمە زیاتر پەیوەندیی بە خەسڵەت و سروشتی مرۆڤەوە هەیە، پەیوەندیی بەو خاڵە لاواز و جەوهەرییەوە هەیە، کە لە سروشتی مرۆڤدا هەبوو، پێی دەڵێن، شۆرەت و ناوبانگ.

خۆرئاوای سەرمایەداری دەرفەتی ئەوە بە هەموو نووسەرێکی کارا دەدات، بە بەرهەمەکانی بژی. لێرەوە ڕەنگە نووسین ڕێگەیەک بێت بۆ خۆدەوڵەمەندکردن، بەڵام لێرە (واتە لە خۆرهەڵاتی کانگەی حیکمەت و دانایی)، نووسین بۆتە دەسوێژێک بۆ دەرکەوتن و بەدەستهێنانی پلەوپایە. واتە ئافراندن دەبێت بە پلەوپایەیەکی کۆمەڵایەتی. کتێبێک لە بواری ئەدەبی یان ڕەخنە یاخود سیاسەتدا بڵاو بکەرەوە، ئیتر لە ڕێی ڕۆژنامە زۆروزەبەن و شاشەی تیڤییە بێشوومارەکانەوە، خەڵک دەتبینن و دەناسرێیت. کتێب لای ئێمە، تەنها بۆتە بەهانەیەک بۆ خۆدەرخستن و هیچی تر.

زۆر گرنگ نییە لە دووتوێی کتێبەکەتدا چی هەیە. تەنها بەرگی یەکەمی گرنگە (لەوێدا ناوت دەنووسن)، بەرگی دواوەش گرنگە، چونکە لەوێدا باست دەکەن. ئەوەی گرنگ و سەرەکییە، ئەمەیە. لە ئێستادا بە هیچ شێوەیەک کەس

کتێب ناخوێنێتەوە. تەنانەت خوێنەری ڕۆژنامەکانیش وایان لێ هاتووە، تەنها مانشێت و سەرباسەکان دەخوێننەوە. لەبری ئەوەی خۆت بڕەنجێنی و خەریکی نووسینی کتێبێک بیت، هەوڵی ئەوە بدە پەیوەندیی خۆت لەگەڵ ئەوانەدا خۆش بکەیت، کە وتاری ڕەخنەیی لە ڕۆژنامەکاندا دەنووسن. ڕێگەکەت کورت بکەرەوە و دەبەنگ مەبە. ئەوەی لە ئەدەب و نووسینەکانت گرنگترە، ئەوەیە چۆن بتوانیت ڕیکلام بۆ ناوی خۆت بکەیت، چونکە بەهای تۆ لە ناو و ناوبانگدایە.

مەترسییەکی دووسەرە، جەنگ و ئایەخی:

جەنگێکی تر بەڕێوەیە. ئەمە یەکەم جارمان نییە. سەدەیەکە لە شەڕی بەردەوامداین، بەلام ئەم جارەیان پێدەچێت کارەساتەکە گەورەتر بێت. شەڕ لەو ولاتانەی ئێمەدا، هەمیشە بەهانەیەک بووە بۆ دواکەوتوویمان... دوژمن بۆتە بەهانەیەک، بۆ هەموو شکست و نشوستییەکمان. بەلام شەڕ تەنها هەر شەڕە و مەترسییەک نییە لەسەرمان. هەڕەشە و مەترسییەکان هەر لە دەرەوە نایەت، بەڵکوو لە ناوەوە و لەناو خۆشمانەوە دێت.

هەندێ جار هەڕەشە و مەترسی، ناوی ئایەخییە. ناوی گەمژەیی و نەزانین و نەخوێندەوارییە. لافلێدانی مەعریفە و خۆبەشتزانینە. با هەریەکێک لە ئێمە، لە ژوورێکی داخراودا دابنیشێت و بکەوێتە دادگاییکردن و لێپرسینەوە لە خۆی. کاتی خۆی لە چیدا سەرف کردووە؟ چەند هەوڵی بەخەرج داوە؟ چیی پێشکەشی جیهان کردووە. هیچ نابەخشین، کەچی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ، داوای ئەو شتانە لە دنیا دەکەین،

کە جیهان ناتوانێت بە کەسی ببەخشێت.

ئەرکی نووسەر:

باگێژەی ژیان ڕەحم بە کەس ناکات. لەم جیهانە پڕ هەراوزەنا و توندوتیژییەدا، پێویستیمان بە کەسانێکە، ئارام بن و هێمنانە بیر بکەنەوە. کەسانێک، بە تێڕامان و هەوڵ و کۆششکردن، ببنە ئاوێنەی ئەم دنیایە. سەیری دەست و پەنجەیان بکەین، تا وێنەی شتەکانمان لە بەرچاو ڕوون ببێت و نەخشە و ژیان و ڕێگە و ئامازەکان بەڵەد بین، ڕووناکیبەخشی کپ و خامۆش ببینین. تەنها شتێک لە نووسەر داوا بکرێت، ئەوەیە ڕاستگۆ بێت. واتە لەپێناو نووسیندا بنووسێت. بۆ ئەوەی ببێتە ئاوێنەی جیهان.

هەموو مرۆڤێک ناتوانێت بە ڕوون و ڕەوانی وێنەی جیهان لە ناخی خۆیدا ببینێ، هەموو مرۆڤێکیش ئامڕازی پێویستی پێ عەتا ناکرێت، تا بتوانێت بە وشە سەرلەنوێ ئەو وێنەیە دابڕێژێتەوە. دواجار مەسەلەکە هەر ئەوەیە، ئەرکی نووسەر ئەوەیە بنووسێت. لەپێناو نووسیندا بنووسێت، نەک بۆ خاتری پارەوپوول یان شۆرەت و پلەوپایەی کۆمەڵایەتی ئەو کارە بکات.

ئەگەر لە کارەکەی خۆی ڕازی بوو، ئەوا خەنی دەبێت و پڕ دەبێت لە ژیان. ئیتر جیهان دان بەو کارەیدا بنێت یان نا، گرنگ نییە. دەبێت کاری زیاتر بکات، تا دڵخۆشیی خۆی بداتەوە و سەبووریی بێت. هیچ شتێ ون نابێت. ئەو شتانەی نرخ و بەهایان هەیە، ڕەنگە ماوەیەک بیر بچنەوە و بکەونە پەراوێزەوە، بەڵام دواتر دەر دەکەونەوە.

ئەرکی نووسەر ئەوە نییە عەودالّی شۆرەت بێت و بەدوای ناوبانگدا ڕابکات. نێوبانگ و شۆرەت کەمالّیی پێ نابەخشن. کەمال لە ناخی مرۆڤ خۆیەوە دێت و چاوەکانت جیهان پڕ دەکات، ئەگەرچی کەسیش نەتناسێت و کەسیش ئاگاداری کارەکانت نەبێ. لە مێشکی خۆتدا بۆ ئارامی و بەهای خۆت بگەڕێ، نەک لە مێشک و چاوی ئەوانی تردا بۆی بگەڕێیت. وێنەی تۆ لای ئەوان: سەری ئەوانی دی توناوتونێکە، پڕیەتی لە ئیرەیی و پووچی و پۆخڵەوات. شوێنێکە، هەوای بێگەردی تێدا نییە. کەواتە لەناو مێشک و بیرکردنەوەی خۆتدا بە. بە مێشکی خۆت بیر بکەرەوە و بخوێنەرەوە و مەزەندەی شتەکان بکە. ئەمە پەیوەندیی تۆیە بە جیهانەوە. ئەوەیە لەنێوان دۆست و هاوڕێیانتدا دابنیشیت و لە سروشت و پەیوەندیی نێوان مرۆڤەکان و جیاوازیی بارودۆخەکان ڕابمێنیت، بە ناخی شتەکاندا شۆڕ ببیتەوە و هەموو ئەوانە بنووسیتەوە.

زیندەگی زۆر بەخێرایی گوزەر دەکات و بیرکردنەوە و تێگەیشتنیش بەکاوەخۆ دێت. بیرت نەچێت، بۆ نووسین، تەنها بەهرە و دەستڕەنگینی بەس نییە و ئەمانە ناتگەیەننە مەنزڵ، گرنگتر لەوانە، تەندروستیی جەستە و ڕۆحە، مێشککراوەیی و بەهێزیی ئیرادەیە. دوای ئەوە خۆت بسەلمێنە. سەیری ئەم دنیایە بکە و چی دەبینیت، بینووسە، بەلام خەیالت بیر نەچێت.

بەردەوام فەیلەسووفانی سەدەی نۆزدەهەمت لە بەرچاو بێت. هەموو کەس پێویستی بە خەیاڵە، نەک هەر بۆ ئەوەی ئەو شتانە ببینی کە سروشت خوڵقاندوونی، بەڵکوو بۆ

ئەوەی ئەو شتانەش ببینی، کە خۆی هەوڵی دروستکردنی داون و بێئەنجام بوون. هەموو ئەمانەت لەبیر بێت و حەزی شکۆمەندی و ناوبانگپەیداکردن بخە لاوە. بەها و قورسایی تۆ لەوەدایە، کە دەیکەیت و بەرهەمی دێنیت. لەوەدایە دەینووسیت و بەردەستی خەڵک دەکەوێت، نەک لەو قسە و پیاهەڵدانانەدا بێت، کە ئەمڕۆ پێت دەڵێن و سبەینێ نامێنێ و وەک دووکەڵێک دەچێت بە ئاسماندا.

# سەرچاوەکانی ئەدەب

ئایا ئێمە سەرچاوەکانی ئەدەب پێدەزانین؟ کۆیتزی لە کتێبی بیرەوەرییەکانیدا *لاوان*، چاپی ٢٠٠٢ دەنووسێت، لە سەروەختی خوێندنی لە زانکۆکانی لەندەن، کتێبی ولیام بێرشلی لە کتێبخانەی مۆزەخانەی بەریتانیادا خوێندۆتەوە. شوێندەستی ئەم کتێبەی بێرشل *سەفەر بۆ قوولاییەکانی باشووری ئەفەریقا*، بەسەر زۆربەی کارەکانی کۆیتزییەوە دیارە.

خاوەنی کتێبی ژیانی مایکڵ ک. و. سەردەمەکەی، چاپی ١٩٨٣ (مەبەست کۆیتزییە - و. ک.)، ڕاستەوخۆ لە پەراوێزی کورتەڕۆمانێکیدا، کە جاکۆب کۆیتزی پاڵەوانیەتی، ئاماژە بەو کتێبەی بێرشل دەکات. سەرچاوەکانی کۆیتزی زۆرن: ئەم کتێبە سەفەر بە قوولاییەکانی باشووری ئەفەریقادا، کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەمدا نووسراوە، یەک لەو سەرچاوانەیە.

ئایا نووسەر دەتوانێت سەرچاوەکانی ئەدەبیی خۆی ئەژمار بکات؟ شارە نەبینراوەکانی ئیتالیۆ کالڤینۆ، لە سەفەرەکانی مارکۆ پۆلۆوە دەست پێ دەکات. ڕۆمانەکەی

کۆیتزی *لە چاوەڕوانیی بەربەرییەکاندا*، لەکوێوە دەست پێ دەکات؟ لە جیهانی کافکاوە؟ لە *دەستنووسێکی کۆن* و *پەیامی ئیمپراتۆری* و *شوورای مەزنی چینەوە*؟ ئەی سەد ساڵ تەنیایی سەرچاوەکانی خۆی لەکوێدا دەدۆزێتەوە؟

ڕۆمانی پیدرۆ پارامۆی خوان ڕۆلفۆ، کاریگەریی لەسەر مارکیز هەبوو. کاریگەریی زیاتر لەسەر (سەد ساڵ تەنیاییە، یاخود لەسەر *مەرگی ئەرتیمیۆ کرۆزی* کارل فۆینتسە؟ چەند پەرەگرافێک لە نەسکی یەکەمی ڕۆمانی مەرگی ئەرتیمیۆ کرۆزدا هەیە، دووبارەکردنەوەی گفتوگۆی نێوان پیدرۆ پارامۆ و بەڕێوەبەری کێڵگەکەیەتی لە ڕۆمانەکەی خوان ڕۆلفۆدا. ئایا خوێنەر ئاگای لەوەیە؟

ئەدەب بەناو یەکدا دەچێت. ڕەنگە پیدرۆ پارامۆ لە *گراکوسی ڕاوچیی* فرانز کافکاوە دەستی پێ کردبێت؟ ژەنەڕاڵ جافلانی هاوڕێی کروز، دوای چەند ساڵێک دەکەوێتە ڕێ بەرەو ماکۆندۆ، هاوکات چیرۆک و بەسەرهاتەکانی *العهد القدیم* خۆیان بەناو جیهانی مارکیزدا دەکەن.

تێکەڵبوون و بەیەکداچوونی ئەدەب لە سەدەی بیستەمدا، بە چاکترین شێوە لە جیهانی بۆرخیسدا هەیە. بۆرخیس بە جۆرێک بەرهەمی نووسەرانی بەر لە خۆی دەخوێنێتەوە، وەکوو ئەوەی بیاننووسێتەوە. لای ئەو، سنوورێک لەنێوان خوێندنەوە و نووسیندا نییە. ئایا ستایلی نووسینی بۆرخیس جیهانبینیی دیاری دەکات، یاخود ئەوە دنیابینیی ئەوە، کە ئەو ستایلەی دەستنیشان دەکات؟ لە چیرۆکەکانیدا توانای ئەوەی هەیە، ڕۆمانگەلێکت بۆ کورت و پوخت بکاتەوە. ژیانی تیدیۆ ئیزیدۆرۆ کروز نموونەیەکە لەوە. *مەرگێکی دی* و

*پیاوی مردوو* لەو چیرۆکانەن، کە یەک جار ناخوێندرێنەوە.

سەرچاوەکانی بۆرخیس چین؟ لە ژماردن نایەن. بۆرخیس بە چیرۆکی *وایکفیلدی* هۆسورن سەرسام بوو. هۆسورن هەواڵی ئەو چیرۆکەی لەکوێ خوێندۆتەوە (پیاوێک لەناکاو ماڵ و منداڵەکانی جێ دێڵێت و بەنهێنی دەچێت لە ماڵێکی ئەوبەریاندا دەژی، بۆ ماوەی چەند ساڵێک لەو ژیانە نهێنییەی خۆیدا لە دەرەوەی دنیا دەمێنێتەوە). هۆسورن لە یەکەمین دێڕی چیرۆکەکەیدا دەڵێت، "بەسەرهاتی ئەم پیاوە سەیرەم لە ڕۆژنامەیەکدا خوێندۆتەوە" و دەڵێت، چیرۆکێکی ڕاستەقینەیە. ئایا باوەڕی پێ بکەین؟ بۆچی باوەڕی پێ بکەین؟ بۆچی باوەڕی پێ نەکەین؟ ئەم چیرۆکە وایکفیلد ناهێڵێت هۆسورن بیر بچێتەوە.

تۆ بڵێی ئەو چیرۆکەی سەرەتاکانی لە هەواڵێکی ڕۆژنامەوانیدا بێت؟ ئەمە هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت. نرخی ئەو چیرۆکە، لە وشەکانیدایە. لە توانای خەیاڵ و فانتازیای هۆسورندایە، کە کارەکتەری وایکفیلدی پێ وێنا دەکات. ئەمە سەرچاوەی ئەدەبە: خەیاڵ. ئەگەر خەیاڵی هۆسورن نەبووایە، هەرگیز چیرۆکی وایکفیلد بە ئێمە نەدەگەیشت. ستایلی هۆسورن لەم چیرۆکەدا، پێدەچێت نامۆ بێت پێی. وا دیارە بە ستایلی بۆرخیس دەچێت! بۆرخیس لەدایک نەبووبوو، کاتێک هۆسورن ئەم چیرۆکە نووسیوە!

کویتزی، کە کتێبەکەی بێرشل دەخوێنێتەوە، لە ناخی خۆیدا هەست بە شتێکی سەیر دەکات. زۆر حەز بەوە دەکات کتێبێکی وەک ئەوە دەربارەی کۆچ و سەفەر بنووسێت. دەیەوێت دەربارەی سەفەرکردن بۆ باشووری ئەفەریقا لە

سەرەتای سەدەی نۆزدەدا بنووسێت. ئەمە چۆن بکات، لە کاتێکدا ئەو لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمدا دەژی؟ ئیڤۆ ئەندریچ، ئەو پردە کۆنە یارمەتیی دەدات، کە بەسەر ڕووباری درینـاوە ماوەتەوە. کویتزیش، بێرشل کۆمەکی دەکات.

ئەی کێ کۆمەکی بە تۆلستۆی کرد؟ ئەدەب تێکەڵ بە مێژوو دەبێت، هاوکات تێکەڵ بە جوگرافیاش دەبێت. هەرچی کۆمەک بە ئەدەب بکات، تێکەڵ بە بواری خەیاڵ و فانتازیا دەبێت و دەبێت بە بەشێک لە ئەدەب. جیهان هەڵدەمژێت، وەک چۆن ئیسفەنج ئاو هەڵدەمژێت. خوێندنەوەی ئەلیادە نموونەیەکە.

هەوڵدان بۆ نووسینی کتێبێکی هەمەلایەن - کتێبێک جیهان لەخۆ بگرێت - لای هۆمیرۆس هەیە، هەروەها لای دانتییش هەیە. ئەم حەز و ویستە *مندالانە*یە چیمان پێ دەڵێت؟ بۆچی هۆمیرۆس لە دەسپێکی ئەلیادەدا لە سزایەک دەترسێت؟ لەوێدا باس لە شاعیرێک دەکات، کوێر و کەڕ بووە و تارەکەی لە لێدان کەوتووە.

هۆمیرۆس بۆچی دەترسێت؟ لە کێ دەترسێت؟ لە چی دەترسێت؟ ترسی دانتی ئەو وێنە تەماوییە دروست دەکات، کە لە *دۆزەخ*دا دەیبینین. ئەمە ترسی دانتییە یاخود توندوتیژیی ئەوە؟ ئەدەب لەکوێوە سەرچاوە دەگرێت؟ لە خوێندنەوە یان لە ژیان، یان لە ناخی مرۆڤ خۆیەوە؟ سەرچاوەکانی ئەدەب ئاڵۆز و نادیارن، ئەمەش نهێنیی ئەدەبە. ئەدەب پێویستی بە پێناسە نییە. ئەدەب هەیە، وەک چۆن دنیا هەیە. تەنها بە یەک مەرج: بخوێنرێتەوە.

ئەو کتێبەی داخراوە و لەژێر زەویدا شاردراوەتەوە،

بوونــی نییــه. ئەمــە ڕاســتە؟ ڕەنگــە ڕاســت نەبێـت و لــە جێـی خۆیدا نەبێت. ســاڵ دێت و دەڕوا و خوێنەرێک دێت و لەســەر ڕەفــەکان دەســتی بــە کتێبێـک ڕادەگات و دەیکاتــەوە. تــۆز و غوبــاری ســەری دەســڕێت و دەیکاتــەوە. چــی دەخوێنێتــەوە؟ وشــە بەدوای وشــەدا دێت. وێنــەکان دێنە بەرچــاوی، کەســەکان و دوورگــە و شــوێن و هەســت و نەســتەکان. وشــەکان، دەستەواژەکان، کە بــە خوێندنــەوەی جار لــەدوای جاریان تێیان دەگەیــن و پێیــان ئاشــنا دەبیــن. ئەمــە ژیانــی ئەدەبــە، چــاوگ و ســەرچاوەی لەکوێیــە؟ لــە ناخدایــە.

# پیدرۆ پارامۆی خوان ڕۆلفۆ

پیاوێک بۆ ماڵەکەی دەگەڕێتەوە. ئایا ئەو ماڵە دەدۆزێتەوە؟ ئایا ماڵ هەر وەکوو خۆی دەمێنێتەوە، دوای ئەوەی بەجێی دێڵین؟ دوای ئەوەی دەر دەکرێین لێی و ناچار دەکرێین جێی بهێڵین؟ دوای ئەوەی ڕۆژگار کەلێنێک دەخاتە نێوانمان، کە پڕ نابێتەوە؟ دوای هەموو جەنگێک دەگەڕێینەوە بۆ ماڵەکانمان. ئەو کاتەش ئێمە گۆڕاوین و جیهانیش گۆڕانی بەسەردا هاتووە. لە هەر چرکەساتێکی تەمەنماندا، شتگەلێک لەدەست دەدەین و شتگەلێک بەدەست دێنین. ئەوانەی دوای ماوەیەکی دوورودرێژ دێنەوە بۆ نیشتمان، ئاخۆ نیشتمان دەدۆزنەوە؟ هەر هێندەی ماڵەکانمان بەجێ هێشت، وەک ئەوە وایە ئاسەواریان نەمێنێت و تیا بچن. ئەوەی لەو ماڵانە دەمێنێتەوە، ماڵە واقیعییەکە نییە، بەڵکوو ماڵێکی خەیاڵییە. خەیاڵییەک، تا ئەبەد لە ناخماندا دەژی و نامرێ.

پەنجا ساڵ بەر لە ئێستا، خوان ڕۆلفۆ (١٩١٧-١٩٨٦) دەستی بە نووسینی تاکە ڕۆمانەکەی خۆی کرد بە ناوی پیدرۆ پارامۆوە. شایانی باسە، پێش ئەم ڕۆمانەی، یەک

کۆمەڵەچیرۆکی لە ساڵی ١٩٥٣دا بە ناوی *دەشتی سووتێنەر* بڵاو کردبووەوە. دوای ئەوە دەستی بە نووسینی پیدرۆ پارامۆ کرد. ئەم ڕۆمانە لە ساڵی ١٩٥٥دا چاپ کرا و بڵاو کرایەوە. دوای ئەوە خوان ڕۆلفۆ هیچ شتێک بڵاو ناکاتەوە. دەبێت سەربوردەی ئەم نووسەرە مەکسیکییە چی بێت؟ بۆچی تەنها ڕۆمانێک دەنووسێت و دوای ئەوە بێدەنگ دەبێت؟

پیدرۆ پارامۆ هەر لەگەڵ بڵاوبوونەوەیدا، ناوبانگ و شکۆمەندییەکی زۆری پەیدا کرد. چەندین جار چاپ کرایەوە و بۆ سەر زمانگەلێکی زۆریش وەر گێڕدرا. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا، دوای ئەوە هیچ ڕۆمانێکی تر بڵاو ناکاتەوە. ئەو دەڵێت، "من لەپێناو نووسیندا دەنووسم و نووسین حەز و ئارەزووی منە، هەرکاتێکیش نەمەوێت بنووسم، نانووسم." هەر لە شوێنێکی تردا دەڵێت، "کار لەسەر پرۆژەیەکی تر دەکەم، پرۆژەیەکی دووروودرێژە و وردەوردە خەریکم." سییەک ساڵ دوای ئەو قسانە، دەمرێت و هیچیش بڵاو ناکاتەوە.

بۆرخیس دەنووسێت، "من دەمەوێت یەک چیرۆک بنووسم، بەڵام بمێنێتەوە، یەک ڕستە بنووسم و بمێنێتەوە. گەر ئەمەم کرد، ئەوا سەروزیادمە." خوان ڕۆلفۆ ئەمەی کرد. جارێک پیدرۆ پارامۆ دەخوێنێتەوە و تا هەتایە بیرت ناچێتەوە. گابریێل گارسیا مارکیز لە ڕۆمانی سەد ساڵ تەنیاییدا، سڵاوێک بۆ ئەو ڕۆمانەی خوان ڕۆلفۆ دەنێرێت.

گوندی كۆمالا، كە سەنتەری رۆمانی پیدرۆ پارامۆیە، لە ماكۆندۆی ماركیزدا رەنگ دەداتەوە. جگە لەوە، رەنگدانەوەی ئەو مردووانەش دەبینین، دوای لەدنیادەرچوونیشیان، هەر ماون و ئامادەن.

هیچ شتێك لەناو ناچێت، مرۆڤ دەمێنێتەوە. لە رۆمانەكەی ماركیزدا، ملكیادس دەگەڕێتەوە بۆ ماكۆندۆ، لەوێ لەناو دۆست و هاوەڵەكانی، لە بنەماڵەی بۆیندیا دادەنیشێت و مەجلیسیان لەگەڵ دەگرێت. هەروەها پیاوێكی دیكەی ناو رۆمانەكە هەیە، بە تیرێك دەكوژرێت، بەڵام دواتر دەگەڕێتەوە و لە ماڵی بكوژەكەیدا نیشتەجێ دەبێت. ئەم پیاوە، شەوانە بەدوای ئاودا وێڵە، تا تینوێتیی بشكێنێ، ئاوێك، برینەكەی بۆ بشواتەوە. ئەفسوونی سەد ساڵ تەنیایی، لە بەیەكداچوونی ئەو دوو جیهانەدایە.

ماكۆندۆ دەكەوێتە كوێوە؟ لەسەر نەخشەی جیهاندایە یان دەكەوێتە ناو مەملەكەتی خەیاڵ و فانتازیاوە؟ وەڵامی ئەم پرسیارە، لە پیدرۆ پارامۆدایە. هەموو ئەو جێ و شوێنانەی ون بوون و نەماون، بەتەواوی تیا نەچوون و نەسڕاونەتەوە. خەیاڵ لە باریدایە هەموو ئەو شوێنانە لە لەناوچوون قوتار بكات و ئێمەش لەگەڵیاندا رزگار بكات.

"هاتووم بۆ كۆمالا، لەبەر ئەوەی پێیان وتم باوكم لێرە دەژی. كەسێكە پێی دەڵێن پیدرۆ پارامۆ. دایكم وای پێ وتم..." ئەمە یەكەمین رستەی پیدرۆ پارامۆیە، كە ساڵح عەلمانی كردوویەتی بە عەرەبی. حیكایەتخوان روو

دەکاتە کۆمـالا بـە ڕێگـە شـاخاوییەکاندا، بەبـێ ئـەوەی هیـچ شـارەزاییەکی هەبێت. ڕێگەگەلێک، کە لـە جیهانـی واقیعییـەوە بـەرەو جیهانـی خـەیاڵ و فانتازیـای دەبـەن. لـە ڕێگـەدا چاوی بـە ڕێبوارێـک دەکـەوێـت و ئەویـش دەبێتـە چاوسـاغی بـەرەو ئـەو گونـدەی لـە دۆڵێکـی قووڵدایـە.

سـەروەختێک حیکایەتخـوان بـۆ یەکـەم جـار و لـەو بەرزاییـەوە گوندەکـەی دەبینێـت (گوندەکـەی باوکـی)، لـە ڕێبوارەکـە دەپرسـێت، چـی بەسـەر ئـەو شـوێنەدا هاتـووە (چونکە چۆڵ و بێکەس دیارە و پێدەچێت کەسـی تێدا نـەژی). ڕێبوارەکـە وەڵامـی دەداتـەوە و دەڵێـت، "نـەک پێدەچێـت وا بێـت، هـەر بەڕاسـتی وایـە و کـەس لێـرەدا نـاژی."

"ئەی پیدرۆ پارامۆ؟"

"پیدرۆ پارامۆش چەند ساڵێکە مردووە."

حیکایەتخـوان بـە گوندەکـەدا دەکەوێتـە گـەڕان. گوێبیسـتی چرپـە و هەناسـە دەبێت و لـە بـاران ڕادەمێنێت. چۆن دەبێت ئـەم گونـدە چـۆڵ بێـت، لـە کاتێکـدا هەمـوو ئەوانـە لەنـاو ئـەو ماڵانـەدا دێـن و دەچـن، کـە گژوگیـا دای پۆشـیون؟ هێـدی هێـدی ئـەو گونـدە بـەرەو ناخـی خـۆی پەلکێشـمان دەکات. چیـرۆک و بەسـەرهاتگەلێک، وەکـوو شـیعر دێـن و دەچـن. دیالۆگگەلێکـی زۆر بەهێـز، لەگـەڵ گێڕانەوەیەکـی بێئەنـدازە جـوان و هونەریـدا.

ڕۆلفـۆ نووسـەرێکی ئاسـایی نییـە. ئـەم کـوڕە دێهاتییـە مەکسـیکییە، لـە یـەک کاتـدا میراتگـری هامسـۆن و شکسـپیر

و ولیەم فۆکنەرە، پاشان لە ناخی خۆیەوە شتێکی تایبەتی سەربار دەخات. ئەم هەموو بەهرە و مەعریفەیە، کەچی تەنها تاکە ڕۆمانێکی پێ دەنووسرێت!

خوان ڕۆلفۆ لە پیدرۆ پارامۆدا دەگەڕێتەوە بۆ جیهانی لەدەستچووی منداڵی. دێت گوندێک دروست دەکاتەوە، کە گوندەکەی خۆیەتی، بەڵام هاوکات گوندێکیشە، خەیاڵ دەیخوڵقێنێت. ڕۆلفۆ هەر زوو گوندی مەکسیک بەجێ دێڵێت. کەسوکاری لە شەڕوشۆڕشەکاندا تیا دەچن. دوای ئەو هەموو توندوتیژییە، لە مەکسیکۆی پایتەخت دەگیرسێتەوە. لە پایتەختەوە وەزیفە جارێکی تر بەرەو گوندەکانی دەباتەوە. پاش ئەو سەردانانەی، ڕۆمان و چیرۆکەکانی دەنووسێت. ئیتر دوای ئەوە هیچ بڵاو ناکاتەوە. تۆ بڵێی وازی لە نووسینیش هێنابێت؟

ئەڵێن جارێکیان وتوویەتی، "خەریکی نووسینی ڕۆمانێکە بە ناوی *زنجیرە شاخ*ەوە." ئایا لەو قسانەیدا ورد بووە و بەڕاستی بووە؟ دەتوانین مەزەندەی ئەوە بکەین، پیاوێک دەچێتە کتێبخانەیەکەوە و لەسەر تاقێک ئەو ڕۆمانە دەبینێت، زنجیرە شاخ. ناوی نووسەرەکەی دەخوێنێتەوە، نووسراوە خوان ڕۆلفۆ.

ڕۆمانەکە دەکاتەوە و دەست دەکات بە خوێندنەوەی. لەگەڵ یەکەم ڕستەدا، هەستێکی سەیر دای دەگرێت و هەست دەکات گەڕاوەتەوە ناو لانەی منداڵی، گەڕاوەتەوە ماڵێک، زۆر دەمێکە ونی کردووە و جێی هێشتووە. ئەوەتا لەو

کاتـەدا دەیخوێنێتـەوە، دەگەڕێتـەوە ئـەو قۆناغـە. بـا هـۆکاری ئەوەتـان پێ بڵێم، یەکەمین ڕستە کە دەیخوێنێتـەوە، ئەمەیە: "بۆیـە هاتـووم بـۆ کۆمـالا، چونکـە پێیـان ڕاگەیانـدم باوکـم لێرە دەژی، باوکـم کەسـێکە، پێـی دەڵێـن پیـدرۆ پارامـۆ..."

# جیهانی دانتی

ئایـــا جــیهانی دانتی بە جیهانـــی ئێمە دەچێت؟ سەروەختێک خـــەریکـــی دۆزەخ بوو، چیی دەنووسـی؟ بەرگی یەکەم لـە *کۆمیدیا*، تووشـی فۆبیـات دەکات. بۆچـی دانتـی وێنـەی ئـەو هەمـوو دزێـوی و ناشـرینییانە لەژێـر زەویـدا دەکێشـێت؟

بڵێی دەربارەی جیهانێکی خەیـــاڵی بنووسێت، یان باس لە جیهانێک دەکـات، کــە تێیدا ژیاوە؟ ئەو ئــەدەبە ڕەخنــەییەی باس لـە دانتی دەکات، سـەدان بــەرگ دەبێت. کتێبخانەیــەکی تــەواو، بەرهەمـی کــۆمیدیایە. دانتـی ئـەو داستانــە سـەیرەی لـە سەردەمــی شــەڕ و ئاشـووبە ناوخۆییەکانـدا نووسـی. لـە تەراوگـە دەژیـا ، دوور لـە زێـدی خـۆی، کـە شـاری فلۆرنسـا بـوو.

دەور گـۆڕاو کاتێـک سـەیری کـرد، لـە دەرەوەی سیسـتمی شــتەکانە. ئـەو پیـاوەی کوشـتەی سیاسـەت بـوو، باڵیـۆزی شـاری فلۆرنسـا بوو لـە ڕۆمـا، لـە شـەو و ڕۆژێکدا بـــوو بـە وێڵگەردێکی بێمـاڵ و بێنیشـتمان. ویسـتی دوژمنەکـەی دیـاری بـکات. ئەبێـت کـێ دوژمنـی بێـت؟ پاپـا یـان ئیمپڕاتـۆر؟ ئایـا دوژمنەکـەی دەناسـێت؟

دوای چەند ساڵێک، مێشوولەیەک کوشتی، کاتێک بە ناوچە پڕ لە زۆنگ و زەلکاوەکانی دەرەوەی ڕاڤینادا ڕەت دەبوو، ئەو مێشوولەیەی مەلاریا دەگوازێتەوە، تا و مردنی پێ بەخشی. ئایا ئەو پیاوەی *دۆزەخ* و *بەرزەخ* و *بەهەشتی* نووسی، بە ژەهری مێشوولەیەک مرد؟ وێنەی مەرگی سەخت و مەرگی ناکۆتاگی، جیهانی دانتییان داگیر کردووە. لە نیوەی کاروانی ژیانیدا (دوایین ساڵی سەدەی سیازدە)، چووە ژێر خاک. بەتەنها نەچووە خوارەوە. لەگەڵ ڕێبەرێکدا ڕۆیشت. کێ ڕێبەری بوو؟ ڤێرجیل. خاوەنی ئەنیادە، شارەزای جیهانی خوارەوەیە.

دانتێ هۆمیرۆسی نەکردە ڕێبەر... زمانی یۆنانیی نەدەزانی. ئەوەی دەربارەی هۆمیرۆس دەیزانی، لە سەرچاوە لاتینییەکانەوە وەری دەگرت. لە ئۆدیسەدا، دوو جار دەچینە خوارەوە، بۆ سەر زەمینی مردووان. قەلەڕەشێک دەبینین، جەرگی پیاوێک دەر دێنێ، توورەکەی خوێن بە دەنووک کون دەکات.

قەشە ئۆگەستینیش، کە لە سەدەی چوارەمی زایینیدا ژیاوە، ئەویش پێی وا بووە هۆمیرۆس قورسە و دوورەدەستە. لە دانپیانانەکانیدا کتێبی یەکەمدا دەڵێت، "هەر لە منداڵییەوە حەزم بە لاتینی کردووە و خولقم لەگەڵ زمانی یۆنانیدا نەبووە." ئۆگەستین سەردەمی منداڵیی لە باکووری ئەفەریقادا بەڕێ کردووە. دوای چوونی بۆ میلان، هەر دڵی لە قرتاجە بووە.

کاتێک دەگەڕێتەوە بۆ ئەفەریقا، بیری میلان و ئەو شتانەی دەکات، کە لەوێ بینیبوونی. دانتێش وەکوو ئەو

وایـە، جێگەیەکـی بیـر ناچێتــەوە پێیـدا گـوزەری کردبێـت. شـوێن لـە نـاخ و قووڵاییـی دانتیدایـە، بەتەنهـا هــەر شـوێنیش نـا، بەڵکـوو هەسـتوسـۆز و دۆخـی دەروونییـش. ئایـا بەڕاسـت دانتـی دابەزییـە ژێـر زەوی؟ ئـەو خەڵکوخوایـەی لـە خـوارەوە دەیانبینێـت، پێشـتر لـە سـەرەوە بینیونـی. نـەک تەنهـا دوژمنـان، بەڵکوو هاوڕێیانیـش. کەسـانێکی زۆری بینیـوە، کـە لـە ژمـاردن نایـەن، کەسـانێک، کاتێک لەنێوان مـاڵ و شـەقام و دوکانەکانـدا هاتـووە و چـووە، پێیـان ئاشـنا بـووە. خەڵکێکیـش لـە کاتـی خوێندنـەوەی دەستنووسـەکاندا ناسـیونی.

دانتـی لـە سـەردەمێکدا ژیـاوە، سـەردەمی پێش دۆزینـەوەی چـاپ و چاپەمەنـی بـووە. دەستنووسـە کۆنەکانـی دەخوێندەوە و دەیبینـی، خەڵکێک لـەو کتێب و دەستنووسانەوە دێنە دەرێ و لەتەنیشـتیدا دادەنیشـن. دانتـی کێ بـوو؟ لـە سرووودی چـوارەمی دۆزەخـدا (کـە هێشـتا سـەرەتای داسـتانەکەیە)، چـاوی بـە هۆمیـرۆس و ئۆڤید دەکەوێـت و دەکەونـە قسـەکردن لەگەڵیـدا. ئـەم متمانـە ترسـناکەی بـە خـۆی، لەکوێـوە بـۆ دێـت؟ سـەیر دەکات بۆتـە ڕکابـەری هۆمیرۆس، بێ ئـەوەی چـاوی بـە چـاوی کەوتبێ. شانبەشـانی ڤێرجیل دەڕوات. وا خـۆی نیشـان دەدات، دەترسـێت. کاتێـک سـەیری ئۆگۆلینـۆ دەکات، کـە ئامبـازی دوژمنەکـەی بـووە و قـەپ بـە لاملیـدا دەکات. بڕبڕەی پشـتی دەشـکێنێ و مێشـکی لـووش دەدات.

پیاوێـک بـە ددان پیاوێکـی تـر دەخـوات. دانتـی سـەیری بوونەوەرگەلێـک دەکات، لـە چاڵێکـدا و وەسـفێکی شـیعری دەنووسـێت. ئـەم هێـز و توانایــەی لەکوێـوە بـۆ دێـت؟ دانتـی ئەزموونـی جەنگـی کردبـوو، ژیانێکـی ئاسـانی نەگوزەراندبـوو.

توندوتیژی و دڵڕەقی و دڕندەیی مرۆڤی بینیبوو.

کاتێک دەنووسێت، دەربارەی جیهانێکی فانتازی دەنووسێت، یان دەربارەی ژیانێکی ڕاستەقینە، کە داخی کردووە؟ ئەو کوڕی ئەم سەردەمانەی ئێستا نییە و ئوتومبێلی بۆمبڕێژکراوی نەبینیوە بتەقێتەوە و گڕ بگرێت. ناوی ئەو ئوتومبێلانەی نەبینیوە، کە لەسەر شەقامەکان، خوێن و ئاسەواری مرۆڤەکان دەشۆنەوە. تۆ بڵێی لە خەودا ئەم شتانەی بینیبێت؟

ئەوەی بینیوە، لەسەر شاشەی تیڤییەکان بە کێردی قیمەکێش، سەری مرۆڤ دەپەڕێنن؟ پیاوێکی سەربڕاوی بینیوە، بە دەستەکانی سەرێکی هەڵگرتووە - وەک ئەوەی چرایەکی هەڵگرتبێ و بە تاریکیدا ڕێ بکات. ئایا کاتێک ئەو دێڕە شیعرانەی دەینووسی، دەیزانی وێنەگەلێک دەبینێ، کە پێشتر هۆمیرۆس بینیونی؟ هۆمیرۆس لە سەردەمێکی زۆر کۆندا لەشکرێکی تەواو لە کوژراوان دەبینێ بەرەو ڕووی دێن، بەرەو ڕووی عۆلیس دێن. برین بەزەقی بە جەستەیانەوە دیارە و چاوانیشیان پڕ لە خەمە. بۆرخیس زیاد لە جارێک ئەم دیمەنەی خواستووە و لە چیرۆکەکانیدا بەکاری هێناوەتەوە.

کادارێش هەمان شتی کردووە و سوپایەکی نابینای هێناوە. سوپایەکی کوێر و تێکشکاو، کە لە ئاسیاوە بەڕێ دەکەون، پاشان بەرەو ئەوروپا و لەژێر باراندا بەنابینایی دەگەڕێنەوە بۆ نیشتمان. سوپایەک، لە شەڕدا دۆڕاوە و زۆرێکی لێ بەدیل گیراوە، دواتریش دووچاری سزایەکی سەخت و تۆقێنەر هاتووە: چاوهەڵکۆڵین. لە هەموو ئەو

لەشکرە، یەک سەرباز ماوە ببینێ، تا هاوڕێ نابیناکانی بگەیەنێتەوە نیشتمان و ڕێگەیان نیشان بدات.

ئەو ترس و بیمەی دانتی دەهەژێنێ، کاتێک بە دۆزەخدا تێدەپەڕێت، ترس نییە، بەڵکوو سەراسیمەبوونە. ئەو شتانەی دەیانبینێت، سەیر و تەلیسماوی و ئاڵۆزن، بەلام هەقیقین و هەن. بۆرخیس لە چیرۆکێکدا بە ناوی *ئەلف*، مەزەندەی خاڵێک دەکات لە گەردووندا، تەواوی جیهان لە خۆی دەگرێت. کە سەیری ئەو پنتە دەکات - لە یەک چرکەساتدا، تەواوی دیمەنەکانی ئەم دنیایە دەبینێت. ڕابردوو و ئێستا و داهاتوو دەبینێت. شار و مرۆڤ و ئاژەڵ و دارودرەخت دەبینێت. هەرچی هەیە، دەیبینێ و لە سەیرکردن تێر نابێت. تۆ بڵێی بزانێت ئەوەی دەیبینێ، لە هەموو چرکەساتێکدا دەشێت فەنا ببێت و نەمێنێ؟

بۆرخیس دوای ئەوەی لە هەموو ئەوانە ڕادەمێنێ، هەست بە سەرسامییەکی زۆر و بەزەییەکی بێکۆتا دەکات. ئەو چیرۆکەی باسمان کرد، بۆ یەکەم جار لە ئەیلوولی ١٩٤٥دا بلاو بووەوە. تا ئێستاش هیچ ڕەخنەگرێک باسی لەوە نەکردووە، مێژووی نووسینی ئەو چیرۆکە چەند شتێکی سەیرە، چونکە لە ئابی ١٩٤٥دا (واتە تەنها مانگێک پێش ئەوە)، بۆمبێکی ئەتۆمی بەسەر هیرۆشیمادا دەدرێت. چیرۆکی ئەلف چەند ئاماژەیەکی تێدایە بۆ دانتی.

ئەدەبی بۆرخیس، لێوانلێوە لە کەسانی بەر لە خۆی. ئەوانەی پێش خۆی خوازیاری جەنگ بوون و جەنگیان بەلاوە پەسەند بووە و سەرباز و کەسانی شەڕکەر بوون. بۆرخیس هەرگیز نەچۆتە شەڕەوە، لەگەڵ هیچ دوژمنێکدا

دەستەویەخە نەوەستاوە و لە کەسیشی نەداوە.

دوو جەنگی جیهانیی بینی و ئەزموونی ستەمکارییشی کرد. لە تەمەنی چل سالان نزیک بووبووەوە، کاتێک یەکەمین چیرۆکی خۆی نووسی. دوای ئەوەی سەری بەر پەنجەرەیەکی ئاسنین دەکەوێت، لەپڕێکدا خوێن لە سەری دێت و تووشی خوێنبەربوون دەبێت و تای لێ دێت. کە تای لێ دێت، وا هەست دەکات لە ناوجەرگەی دۆزەخدایە. دۆست و هاوڕێیانی دێن و قسەی لەگەڵ دەکەن. پێی سەیرە هاوڕێکانی بێئاگان لەوەی ئەو لە دۆزەخدایە.

ڕەنگە نەخۆشکەوتن ببێتە هۆی ئەوەی حیکمەتێکمان دەسگیر ببێت. ئاگر دەیسووتاند، وەک ئەوەی لە قازانێک ئاودا بکوڵێت. لە نەخۆشییەکەی چاک دەبێتەوە و بە دوو چاوی کراوەوە سەیری دنیا دەکات و تێناگات، یان ڕەنگە تێشبگات؟ دیقەت لە شتەکان دەدات و هەست بە سەرسامییەکی ناکۆتا و بەزەییەکی بێسنوور دەکات.

لە کۆتاییی سروودی سیوچوارەمیندا، دانتی لە جیهانی خوارەوە دێتە دەرێ. لە کونێکی بازنەییەوە، لە بنمیچی ئەشکەوتێکدا، ڕووناکیی ئاسمان دەبینێ: ئەستێرەکان. دانتی ئاسمان و ئەستێرەی بیر ناچێت. خەیاڵ دەبێتە فریادڕەس و مرۆڤ قوتار دەکات. ئەمە پەند و حیکمەتی دانتییە. ئەدەب هیوا بە خوێنەران دەبەخشێت، گەر بیخوێننەوە.

# کافکا و هاوڕێکانی

کافکا ژیانێکی کورت ژیا. لەسەر ئەم هەسارەیە، تەنها چلویەک ساڵێکی پێ ڕەوا بینرا. ئەگەر نەخۆشیی سیل زەفەری پێ نەبردایە، تۆ بڵێی زیاتری بنووسیبایە؟ فرانز کافکا جەنگی جیهانیی یەکەمی بەزیندوویی تێپەڕاند. ساڵی ١٩٢٤ لە نەخۆشخانەیەکی دەرەوەی شاری ڤیەننا کۆچی دوایی کرد. ژنی نەهێنا و وەچە و بنەماڵەشی لەپاش خۆی بەجێ نەهێشت. ئایا وەچە و میراتگری لەدوای خۆی بەجێ هێشت؟

کافکا بە دووەم جەنگی جیهانی ڕانەگەشت، ئەگەر بگەشتایە، ئاخۆ بەزیندوویەتی تێی دەپەڕاند؟ خوشکەکانی لە ئۆردوگاکاندا جینۆساید کران، هاوکات زۆربەی زۆری هاوڕێکانیشی بەو دەردە چوون. ماکس برۆد، کە میراتیی ئەوی پاراست، لە مەرگ قوتاری بوو. برۆد خۆشبەخت بوو، خەڵکێکی تر ئەو چانسەی ئەویان نەبوو. کافکا نەخۆشیی سیل خنکاندی، نەک گاز. ئەگەر بەسەلامەتی بگەشتایەتە کۆتاییی دووەم جەنگی جیهانی، ئایا شتی

زیاتری دەنووسی؟

دووەم جەنگی جیهانی بە مەرگەساتێکی ئەتۆمی کۆتایی هات. هەورێکی ڕەش ئاسمانی تەنی و مایەپووچی و وێرانەیی دنیا بەدەر کەوت. ڕۆژ هات و چوو، خۆر دەر کەوت و با هەڵی کرد و بەهاری سەوز گەڕایەوە. ژیانی ئێمە ئاوایە. ماڵوێرانی تا سەر نییە. کافکا لە کاتێکدا داوای چۆڕێ ئاوی دەکرد و توانای خواردنەوەی نەبوو، بیری لەم شتانە دەکردەوە. ئەو مرد لە کاتێکدا نەگەیشتبووە قۆناغی پیریتی. مرد و هیچ بنەماڵە و میراتگرێکی لەدوای خۆیەوە جێ نەهێشت. ئایا کەسی لەدوای خۆی بەجێ هێشت؟ کافکا چیی بەم دنیایە بەخشی؟

خوێنەرانی کافکا چی لە کافکا وەر دەگرن؟ ئایا ئەو شتێکی هەیە بیانداتێ؟ ئەگەر دەتەوێت کافکا بناسیت، مەچۆ بۆ *دادگا* و مەچۆ بۆ *کۆشک* و دەست مەدەرە *ئەمەریکا*. ڕاستە هەرجارێک ناوی کافکات بەرگوێ بکەوێ، گوێبیستی ئەو ڕۆمانانەش دەبیت، بەڵام ئەو ڕۆمانانە کافکا نین. گەر بتەوێت کافکا بخوێنیتەوە، پێویستە لە شوێنێکی دیکەوە دەست پێ بکەیت. بڕۆ بۆ ڕۆژانەکانی ژیانی، بچۆ بۆ لای چیرۆک و تێکستە کورتەکانی. ئەمە سەرەتایەکی پیرۆزە.

سەروەختێک کافکا دەخوێنیتەوە، هەست دەکەیت پێشتر ناسیوتە. ئەیناسیت و نایناسیت. ئایا ئەیناسین؟ کافکا بنەماڵەیەکی لەدوای خۆی جێ هێشت، درێژ دەبێتەوە و درێژ دەبێتەوە، بە جۆرێک، باز بەسەر ساتەوەختی ئێستاماندا دەدات. کتێبخانەی بابل، چیرۆکێکی خۆرخە

لویس بۆرخیسە، گەر کافکا نەینووسیبایە، ئایا ئەم چیرۆکە دەبوو؟

گەر کافکا نەینووسیبایە، پیدرۆ پارامۆ، ڕۆمانەکەی خوان ڕۆلفۆ، بوونی دەبوو؟ گەر کافکا نەینووسیبایە، کۆتر، ڕۆمانەکەی پاتریک سوسکەند دەبوو؟ گەر کافکا نەینووسیبایە، جرج، ڕۆمانەکەی ئەندریۆ زانیۆسکی بوونی دەبوو؟ بەبێ کافکا، ژیانی مایکل ک. و. سەردەمەکەی، ڕۆمانەکەی ج. م. کۆیتزی دەبوو؟

مارکیز دەڵێت، "سەروەختێک کافکام خوێندەوە، دەستم بە نووسین کرد." کافکای خوێندەوە، ئەوکات بۆی ئاشکرا دەبێت نووسین چۆنە. لێرەوە ئیتر دەنووسێت. مارکیز باوەڕ دەکات و باوەڕ ناکات. جارێکی دی لە خوێندنەوەی خوان ڕۆلفۆوە دەست پێ دەکات. ئاساییشە گەر لە *ڕۆژانەی ساڵی تاعوونی* دانیال دیفۆوە دەست پێ بکات. ئەو سیانە هاوڕێین. ئایا دەبێتە کوڕی ئەوان؟ ئایا کویتزی لە کەلەکەی ڕۆبنسۆن کرۆزۆوە لەدایک دەبێت؟

بۆرخیس چۆنچۆنی دەبێتە وەچەی کافکا؟ ئەو ئەرژەنتینییە نابینایە، لە تەمەنی هەشتاوحەوت ساڵیدا مرد. بەپیری مرد. کە لە ژیاندا بوو، ڕۆمانی ئەمەریکای لاتین، ناوبانگ و شۆرەتی پەیدا کرد. دوای ئەوەی بە خوێندنەوە چاوەکانی کوێر بوونەوە، بەردەوام گوێبیستی ئەوە دەبوو، ڕۆمانی ئەمەریکای لاتین لەژێر پاڵتۆکەی ئەوەوە سەری دەر هێناوە. لە ئەمەریکای لاتیندا، نووسەرێک نییە خۆی بە قەرزاربـاری بۆرخیس نەزانێت.

بۆرخیس ساڵی ١٩٨٦ مرد. چەند ساڵێکی کەم بەر لە مردنی، *یادەوەریی شەکسپیری* نووسی. ئاسان نییە یادەوەریی شەکسپیر بنووسیت و لە هەشتا ساڵیت تێپەڕاندبێت. ساڵ لەدوای ساڵ، مرۆڤ دیقەت و وردبینیی بەرەو لاوازی دەڕوات. خەیاڵدانیشی کاڵ دەبێتەوە، وەلێ یادەوەریی شەکسپیر، مل بە یاساکانی پیربوون نادات.

خوێندنەوەی بۆرخیس، پەیوەندیی نێوان تێکستەکانی خۆرهەلات و خۆرئاوامان بۆ ئاشکرا دەکات. پەیوەندیگەلێکی قووڵمان بۆ ئاشکرا دەکات، لەنێوان ئەوەی نووسراوە و ئەوەی دەنووسرێت. دنیای ئەدەب، سنوور و دیوار قبوڵ ناکات. تۆ بڵێی قسەی باوکان و کوڕەکانیان قبوڵ بکات؟ خوان ڕۆڵفۆ کوڕی کافکا نییە. کافکا کوڕی تۆڵستۆی نییە. مارکیز کوڕی بۆرخیس نییە. چاکتر وایە باس لە هاوڕێیەتی و دۆستایەتی بکەین. لەبری ئەوەی بڵێین، "ئەوانە نەوەی کافکان،" چاکتر وایە بڵێین، "ئەوانە دۆست و هاوڕێی ئەون." هاوڕێی ئەو پیاوە بوون، کە نەخۆشیی سیل دەردەداری کردبوو. کافکا تا هەنووکەش لەناوماندایە، دەیخوێنینەوە و دەیبینین.

ئیسحاق سنجەر لە شوێنێکدا بە فیلیپ ڕۆس دەڵێت، "خوا کە کافکای پێ بەخشین، ڕەنگە لە بەراییەکانی سەدەی بیستەمدا، شازدە کافکای پێ عەتا کردبین، بەڵام ئێمە تەنها یەک دانەیمان ناسی." "ئایا بەبێ ماکس برود، ئەدەبی کافکا تیا دەچوو؟"

کافکا چۆنچۆنی لە ئەدەبی هاوچەرخدا ئامادە

دەبێتەوە؟ ڕۆمانی *کافکا لە کەنار دەریای* هارۆکی مۆراکامی، کە بەم دواییانە وەر گێڕدرایە سەر زمانی فەرەنسی و پێشتریش کرابووە ئینگلیزی، ئاوڕ لە کافکا دەداتەوە و ئاوڕی لێ ناداتەوە. بە پێچەوانەی ئەوەی میدیای خۆرئاوا لەم ڕۆژانەدا باسی دەکات، مۆراکامی لەم ڕۆمانەیدا، وەک خەسڵەتی هەمیشەییی خۆی، سەرکەوتوو نەبوو. مۆراکامی بۆتە ناوێکی باو و گەورە، ئەمەش هەندێ جار بەرەو هەڵەمان دەبات.

مۆراکامی لە هەشتاکاندا هەندێ لە چاکترین ڕۆمانەکانی خۆی نووسی، کە کاریگەرییان لەسەر خوێنەر زیاتر بوو. *کۆتاییی جیهان و وڵاتی سەیروسەمەرەکان*، چاپی ١٩٨٥، خوێنەر ئەوق دەکات. ئایا ئەم ڕۆمانە لە کافکاوە دەست پێ دەکات و دەگەڕێتەوە بۆ کافکا؟ ئەی پەیوەندیی کافکا بەم ڕۆمانەوە چییە؟ چۆنچۆنی پەیوەندیی کتێبخانەی بابل یان کۆتر یاخود جرج یان لە چاوەڕوانیی بەربەرییەکاندا، بە ئەدەبی کافکاوە دیاری بکەین؟

چی ئەم بەرهەمانە پێکەوە کۆ دەکاتەوە؟ ستایلێکی نۆرماڵ و توندوتۆڵ؟ ڕەنگە هەر ئەمە تاکە هۆکار نەبێت. توانای گۆڕینی شتە خەیاڵی و فانتازییەکان بۆ شتێ ماتریاڵ و واقیعی؟ ئەمەش ڕەنگە هەر کورت بهێنێت و بەس نەبێت. ئەی کەواتە ئەو نهێنییە چییە، کە تەواوی ئەم بەرهەمانە پێکەوە کۆ دەکاتەوە؟ چ شتێ هەموو ئەوانە دەکاتە هاوڕێ: کافکا و بۆرخیس و خوان ڕۆلفۆ و ئیتالۆ کالڤینیۆ و گابریێل گارسیا مارکیز و پاتریک ساسکەند و کویتزی و... هتد؟ چی

ئەمانە کۆ دەکاتەوە؟

خوێنەر ئەتوانێت چەند ناوێکی تر بۆ ئەو لیستە زیاد بکات. بۆ نموونە، هۆمیرۆس و شەکسپیر. زیادکردنی ئەمەی دواییان، هیچ نهێنییەکمان بۆ ئاشکرا ناکات؟ هاملێت بەر لە چەند سەدەیەک سەرنجی دا، جیهان لە کەرەستەی خەون و خەیاڵ دروست کراوە. پەیی بەوە برد، کە تاڵەموویەک واقیع و خەیاڵ لێک جیا دەکاتەوە. ئایا تۆلستۆی کاتێک ئانا کارنینای نووسی، هەستکردن بەو شتە داگیری نەکردبوو؟ ڕۆماننووس چۆن دەتوانێت بنووسێت، گەر ناخی پڕ نەبووبێت لەو هەستە؟

هۆمیرۆس وەک شەڕێکی واقیعی، ئەلیادە ئەنووسێتەوە. ئەو سروودەی وا نووسیوەتەوە، وەکوو ئەوەی مێژوو بگێڕێتەوە. ئەو یۆنانییە نابینا بلیمەتە، فانتازیا دەنووسێتەوە و دەڵێت ئەوە مێژووە. ئایا گەمارۆی تەروادە مێژوویی نییە؟ لە ئەلیادەدا، باسی ئەسپەکەی تەروادە نەهاتووە. ئەلیادە پڕیەتی لە ئەسپ، بەڵام ئەسپەکەی تەروادەی تێدا نییە. لە ئۆدیسەدا باسی هاتووە، بەڵام لە ئەلیادەدا باسی نییە.

ئایا ئەلیادە مێژوویەکی واقیعە بۆ جەنگێکی واقیعی، کە لە نزیک خاکی تورکیادا ڕووی دابێت؟ ئایا ئەخیل پیاوێکە لە گۆشت و خوێن و ئێسقان؟ ساڵان ڕۆیشتن و سەدەکان تێپەڕین، ئێسکوپرووسکەکان بوونە خۆڵ و شارەکانیش دارمان. کامە واقیعییە و کامە خەیاڵییە؟ ئایا هۆمیرۆس واقیعییە و کارەکتەرێکی هەقیقییە؟

کافکا لە بەراییەکانی سەدەی بیستەمدا، دەرگایەکی ئاوەڵا کرد. ئایا دەتوانین دیاریی بکەین، کتومت لە چ چرکەساتێکدا ئەو دەرگایەی خستە سەر پشت؟ ئایا ئەو دەرگایەی ئەو کاتە کردەوە، کە یەکەمین دێڕی لە کورتە ڕۆمانی *بەدگۆڕان* نووسی؟ مارکیز دەڵێت، "ئەو تێکستە تەواوی ژیانی گۆڕیم." مارکیز هەندێ جار وەک کارەکتەرێ ناو ڕۆمانەکان قسە دەکات.

ئایا کافکا سەروەختێک *بەدگۆڕانی* نووسی، دەرگایەکی کردەوە؟ بەر لە بەدگۆڕان، دەبینین دەرگاگەلێک دەکاتەوە و دایان دەخات، دەیانکاتەوە و دایان دەخات. ئەمە بوو بە پیشەی کافکا، کردنەوەی دەرگاکان. تەنانەت ئەو بە خەوتوویش دەیبینی، دەرگایەک دەکرێتەوە و دەمانچەیەک لەو دەرگا کراوەیەوە دێتە ژووری. ئەم خەونبینینە چییە؟

لە خەونیدا، سووراحییەک ئاوی نەبینی پڕ لە ددانی شکاو نەبێت. سووراحییەکە نیوەی ئاوی تێدایە و ڕەنگەکەی لێڵ و بۆرە. لە ئاوەکەدا، ددانی مرۆڤی تێدایە. ژمارەیەکی زۆری ددان. ددانی تەنها مرۆڤێک نا، ددانێک و دووان و سیان و... هتد. ئەم ددانانە چین؟ کێ لەم سووراحییەدا کۆی کردوونەتەوە؟ پێش تۆزێک، پیرەمێردێک ئاوێ لەم سووراحییە دەخواردەوە. چۆنی خواردەوە؟ کافکا ئەم خەونەی نەبینی، ئامرازی سزادان و لێدانی بینی. برینی لە هەناوی پیاوێکدا بینی، کە وەک گوڵ دەمی کردبووەوە. پزیشکێکی بینی بەسەر پشتی ئەسپێکەوە، دێبەدێ ئەگەڕا. دیوارێکی بینی، لە وڵاتی چین دروست دەکرا. دز و

جەردە و دڕندەی بینی، کە چۆن دەست دەگرن بەسەر شارۆچکەیەکدا.

ئەوانە بەربەرییەکانی کویتزین؟ لە کورتەچیرۆکێکی کافکاوە، بە ناوی *دەستنووسێکی کۆن*، لە چاوەڕوانیی بەربەرییەکانی کۆیتزی دەست پێ دەکات. لە چامەکەی کەڤافییەوە دەست پێ ناکات، بەڵکوو لە کافکاوە سەرچاوە دەگرێت. ئایا کۆیتزی ئەمە دەزانێت؟ ڕەنگە بزانێت و لەوانەشە نەزانێت.

کافکا بەر لە جەنگی یەکەمی جیهانی، دەرگایەکی کردەوە. دەرگایەکی کردەوە و پێدەشتێکی بینی، بەرەو ناکۆتا درێژ دەبێتەوە و هێڵی ئاسنینی بینی و وێستگەی *کلدای* بینی. ئایا بەڕاست ئەم وێستگەیە لە پێدەشتەکانی ڕوسیادا هەیە؟ ببێ یان نەبێ، چی لە مەسەلەکە دەگۆڕێت! لە دنیاگەی کافکادا هەیە. کافکا ئەو دەقەی تەواو ناکات. لە ڕۆژانەکانی کافکادا، جارێکی تر بەسەر وێستگەی کلدادا دەکەوین. وێستگەی کلدا، زۆر لە پێدەشتەکانی ڕوسیا هەقیقیترە، کە ناو ئەتڵەسەکانیان داپۆشیوە. ئەتڵەسێک دەکەیتەوە و سەیری نەخشەکان دەکەیت و کلدا نایدۆزیتەوە، چاو دادەخەیت و کلدا دەبینیت.

کافکا دەرگایەکی کردەوە و کەوتە ڕوانین. چاوەکانی کافکا گەورەن. سیمایەکی منالانە و دوو چاوی گەورە. سەیری دنیای کرد و بە شێوەیەک بینیی، وەک ئەوەی تەنها کەسانێکی کەم بەو جۆرە بینیبێتیان، وەک خەون و خەیاڵ بینیی. لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا،

ستیڤنسەنیش هەمان شتی کرد.

کافکا لە بەراییەکانی سەدەی بیستەمدا هات و حەکایەتێکی سەیری نووسی. بە ستایلێکی تۆکمە و پتەو، جیهانگەلێکی خەیاڵی و فانتازیی نووسی. جیهانگەلێکی خەیاڵی، کە هاوتای ئەم جیهانە واقیعییەیە. وەک چۆن خۆی ئەیبینی، وەها ئەم دنیایەی نووسییەوە. وەها کەوتە نووسینەوەی شتە خەیاڵییەکانی، وەک ئەوەی هەواڵێک لە ڕۆژنامەیەکدا بنووسێتەوە. بە دەستەواژەیەکی کۆنکرێتییانە پرۆسەی لەسێدارەدانێکی سەیر باس دەکات. وەک ئەوەی پێت بڵێت، ئەم بەیانییە چیی خواردووە. دەموچاوەکە نە دەگری و نە پێدەکەنی. چاوەکان بۆ دوور دەڕوانن. پێدەچێت پیدرۆ پارامۆ لە چیرۆکی گراکۆسی ڕاوچییەوە دەستی پێ کردبێت.

کافکا بە شێوازی خۆی جیهانی بینی. ئەمەش شتێکە، بۆ زۆر کەس دەست نادات. لە ڕۆژانەکانیدا نووسیویەتی، جگە لە مەرگ، لەسەر شتێکی تر نانووسێت. بۆرخیس دەڵێت، "ئەو تەنها دەربارەی کات دەنووسێت." چاکتر وایە ئەدیبان لەبارەی ئەدەبی خۆیانەوە قسە نەکەن. گەر قسەیان کرد، ئەوا خراپەکاری دەرهەق بە ئەدەب دەکەن. قسەکانیان گرنگ نییە، گرنگ ئەدەبە. هەرچیی ئەوەی لەلات باشە، بینووسە، بینووسە و بە قسە مەیڵێ. ڕۆژانەکانیش بۆخۆی قسەیە، لە پەراوێزی ئەدەبدایە و ئەدەب نییە. ئایا ئەو یادداشتانە کات دەیانکات بە ئەدەب؟ کیمیای ئەدەب شتێکی سەیرە. شتەکان سەروەختێک تۆ دەیاننووسیتەوە،

دەگۆڕێن و گۆڕانیان بەسەردا دێت.

تۆلستۆی دەڵێت، "ئیلهام ئەو کاتانە دێت، کە دەنووسم." ئەمە بە *سفر ایوب* دەچێت و شیعر لە تایەکی گەرمەوە سەرچاوە دەگرێت. ئاگر ئێسک دەسووتێنێ و ڤایرەس و میکرۆبیش، گۆشتی سییەکان ئەکرۆژن و کابراش هەر دەنووسێت. مێروولەیەک دەبینێت لە گۆشتی قوڵ و مەچەکییەوە دێتە دەرێ، سەیرێکی دەکات و دەست دەکات بە ژماردنی مێروولەکان. ئەم هەموو مێروولەیە لەکوێوە سەر دەر دێنن؟

# فرانز کافکای نامەکان و خوان ڕۆڵفۆ و پاتریک ساسکەند و ئەم سەردەمەی ئێستامان

خوان ڕۆڵفۆ مرد، بەڵام پاتریک ساسکەند زیندووە. ساسکەند ڕۆژەکانی لەکوێ بەسەر دەبات؟ تەنانەت ئەگەر لە میونشنیش نیشتەجێ بێت، شوێن و ڕێی پێنازانین. ئەبێت لە چ جیهانێکی خەیاڵیدا خۆی ون کردبێت؟ بۆچی وازی لە نووسین و بڵاوکردنەوەی ڕۆمان هێنا؟ نووسەری ڕاستەقینە (ساسکەندیش نووسەرێکی ڕاستەقینەیە)، چۆن دەتوانێت دەستبەرداری نووسین ببێت؟ چۆن دڵی شەق نابات؟ ئەی چۆن کات (بەتاڵیی کات) وێرانی ناکات؟

خوان ڕۆڵفۆ پێشتر وای کرد، جگە لە پیدرۆ پارامۆ و کۆمەڵەچیرۆکی دەشتی سووتاو، هیچی دیکەی بڵاو نەکردەوە و دوای ئەوە بێدەنگ بوو. باسی ئەوەی دەکرد، ڕۆمانێکی دیکە بە ناوی زنجیرە شاخ دەنووسێت، بەڵام لەسەرخۆ دەیکات و پەلەی نییە. ساڵ هات و چوو، ماڵئاوایی لە دنیا کرد و ئەو ڕۆمانەی هەر بڵاو نەکردەوە. ئایا ڕۆڵفۆ ئەینووسی؟ یان بێدەنگ بوو لە نووسین؟ چۆن تەحەمولی ئەو بێدەنگییە ناکۆتایەی کرد؟

ڕۆڵفۆ نووسەرێکی ڕاستەقینەیە. گەر یەک جار پیدرۆ پارامۆ بخوێنیتەوە، درک بەوە دەکەیت، گەر خوێندنەوەکەت کرد بە دوو جار، ئەوا گیرۆدە دەبیت. ڕەنگە وەکوو گابریێل گارسیا مارکیز ئالوودە ببیت پێیەوە (ناوگەلێکی زۆر لە کۆمالاوە - گوندەکەی خوان ڕۆڵفۆ - دەچن بۆ ماکۆندۆ. ملکیادس نموونەیەکە لەوانە). یەک نهێنی هەیە، کە هەردووکیان کۆ دەکاتەوە، ئەو نهێنییەش، خەیاڵە. ڕاستە خەیاڵ نهێنیی هەموو ئەدەبە، بەڵام لای ڕۆڵفۆ و ساسکەند، ئەمە زۆر بە ڕوون و ڕەوانی دەبینین. هەریەک لەم دووانە، خاوەنی خەیاڵدانێکی تایبەتین.

پیدرۆ پارامۆ لە بەردەم تاقیکردنەوەی ڕۆژگاردا خۆی ڕاگرت (نیوسەدە زیاتر بەسەریدا تێپەڕیوە)، بەڵام نازانین ئاخۆ عەتر و کۆتریش خۆیان ڕادەگرن (ئەم دوو ڕۆمانە لە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا نووسراون).

لە کافکادا مەرجەعی ئەو دووانە دەدۆزینەوە، بەڵام کافکای ڕۆماننووس نا (هەموو ڕۆمانەکانی کافکا تەواونەکراون و گەر هەوڵی ماکس برودیش نەبووایە، هەموی تیا دەچوو)، بەڵکوو کافکای نامەکان و بیرەوەری و کورتەچیرۆک نووس. ڕەنگە کافکای ڕاستەقینە (نووسەری ڕاستەقینە) لەناو ئەو بەرهەمانەدا بدۆزینەوە، نەک لەناو ڕۆمانە تەواونەکراوەکانیدا، بەڵکوو لەناو نامەکانیَ و بیرەوەری و چیرۆکەکانیدا.

پێویستە بیر لەو ڕێکەوتە سەیرە بکەینەوە: "بۆچی کافکا ڕۆمانەکانی تەواو نەکرد؟ بۆچی تا دوایین دێڕ و خاڵی کۆتایی ناچێت؟" تەنها بەدگۆڕانی تەواو کرد. ئەمەش زیاتر بە چیرۆکێکی درێژ دەچێت. مارکیز دەڵێت، "لەگەڵ

خوێندنەوەی یەکەم ڕستەی بەدگۆڕاندا، چارەنووسی خۆم زانی."

کافکا نە دادگاییی تەواو کرد نە کۆشک. ڕۆمانە تەواونەکراوەکانی لە سەدەی بیستەمدا، ناو و ناوبانگیان بۆ پەیدا کرد. لەپڕێکدا و لە ماوەی شەو و ڕۆژێکدا، جیهانی واقیعی لەگەڵ خەون و پێشبینییە ڕەشبینەکانی کافکادا بوون بە یەک، وەلێ ئەو ڕەشبینییە زۆر جوانتر لە نامە و کورتەچیرۆک و بیرەوەرییەکانیدا دەبینرێت.

شووراى مەزنی چین نموونەیەکە لەوانە. کتێبخانەی بابلی بۆرخیس، لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. *کۆلۆنییەی سزا* و *پزیشکی گوند* و *ڕاپۆرت بۆ ئەکادیمیا*، چیرۆکگەلێکی سەیر و فانتازی و واقیعین، وەکوو ژیانمان. لەو نامانەیدا، لە نەخۆشخانەی تووشبووانی سیلەوە نووسیویەتی و دواساڵەکانی تەمەنی لەوێدا بردۆتە سەر، کافکا جگە لە خۆی، لە کەسی دی ناچێت. کێشی لە ٦٥ کیلۆوە دادەبەزێت بۆ ٤٩ کیلۆ. لەوەها هەلومەرجێکدا و لە کاتێکدا سیل قوڕگی دەکرۆشێت *جۆزێفینی سترانبێژی* نووسی، ئەو مشکەی ستران بۆ حەشامات دەچڕێت. ئەلیاس کانیتی، کە کافکا باش دەناسێت و دەربارەی نامەکانی نووسیویەتی، نهێنیی ئەوەش دەزانێت، کە پاڵ بە هەندێ نووسەرەوە دەنێت بەرەو شوێنێکی دوور. ئەو شوێنە دوورە لەکوێیە؟

بۆچی ناوبەناو نووسەر (وەک تاکە کەسێک)، ژیانی دوور لە خەڵک و کۆمەڵگە هەڵدەبژێرێت؟ ئایا ئەمە کوشتنی ئەدەب نییە؟ کسینگیان دەترسا تەنها بێت و چێژی ئەدەب و دۆستایەتیی ئینسانەکان لەدەست بدات. لە لایەکی دیکەوە،

تۆلستۆییش ترسی هەبوو (لانی کەم لە دواساڵانی تەمەنیدا) خەڵکوخوا ئارامی و سەلامەتیی ناوەوەی بشێوێنن. کافکا دنیایەکی لە سەریدا دۆزییەوە. لە سەرەتای تەمەنیدا بۆ هاوپۆلێکی خۆی دەنووسێت، کە لە بەردەم دووڕییانێکدایە: یان ئەوەتا ئەوەی لە مێشکیدایە دەینووسێت، یان کەڵلەی شەق دەبات.

بەهای کافکا لە ئالوودەبوونیدایە بە نووسین و لەو خەیاڵەشدایە، کە ئەو ئالوودەبوونە تێر دەکات. لە بەدترین و ناخۆشترین کاتەکاندا (جەنگی جیهانیی یەکەم، بۆ نموونە)، سەرشار بوو بە وزەی نووسین و جوانترین شتی نووسی. ڕۆلفۆ بێدەنگ بوو، پاتریک ساسکەندیش بێدەنگە و کافکاش مرد. ڕەنگە دوای چەند ساڵێکی دیکە، ساسکەند بیر بچێتەوە.

کێ ئەم شتانە دەزانێت؟ ڕەنگە دوای سەدەیەک، کافکاش بیر بچێتەوە! تا ئێستاش هۆمیرۆس دەخوێنینەوە، هەروەها تۆلستۆییش، بەڵام ئاخۆ دوای هەزار ساڵ تۆلستۆی دەخوێنینەوە؟ ئایا نەوە دوای نەوە دەیخوێننەوە؟ لەم ڕۆژگارەدا کەس لە هیچ تێناگات. بەدوای کتێبگەلێکدا ڕادەکەین، کە ڕەنگە دوای چەند هەفتەیەک بیر بچێتەوە. ڕەنگە هەر ئەوە بکەین، کە هەموان دەیکەن: نغرۆبوون لە پووچێتیدا.

تۆ بڵێی نهێنیی وازهێنانی ڕۆلفۆ و بێدەنگیی ساسکەند لەم خاڵەدا بێت؟ ئایا هەردووکیان لەدەست خەڵکوخوا هەڵهاتن؟ ئەدیبانیش هەر خەڵکوخوان؟ نەخێر، نووسەر دەیەوێت خۆی بێت. ئەی ئەگەر ئەوانەی خۆشیان دەوێت بوونە مەترسی بۆ سەر شووناس و تایبەتمەندێتی، بۆ کوێ بچێت و ڕوو

لەکوێ کات؟

تۆ بڵێی ڕۆڵفۆ توانای دۆزینەوەی ئەو هاوسەنگییەی نەبووبێت، کە دەیخواست؟ کافکا نەخۆشیی سیل وێرانی کرد، بەڵام دەڵێت من خۆم ئەو نەخۆشییە کوشندەم گاز کرد، کاتێک بەدرێژاییی شەوان بێدار دەبووم! نامەکانی کافکا ڕێبەرمانن بۆ لای تاکەکەسێک، کە لە هەوڵی ئەوەدا بوو، ببێت بە خۆی. لە کاتێکدا سەرگەرمی ئەوە بوو، جیهانێکی پێ عەتا کردین.

# کلاودیۆماگریس و فرانز کافکا و
# ئەلیاس کانیتی و دیلەکانی سەدەی نۆزدە

دانوب لە دارستانی ڕەشەوە هەڵدەقوڵێت و دەڕژێتە ناو دەریای ڕەشەوە. بەناو ئەوروپادا دەڕوات، لە خۆرئاواوە، لە ئەڵمانیاوە بەرەو خۆرهەلات تا ڕۆمانیا. لە کەنارەکانیدا چەندین شار و گوند و پایتەخت هەن. ڕووبارێکی گەورە و مەزنە. پیاوێک، کە ئالوودەی خوێندنەوە و نووسینە، شوێنپێی ئاوی ئەم ڕووبارە هەڵدەگرێت و لە کتێبێکدا بە شێوەیەکی تایبەت و دەگمەن، مێژووی ئەدەبیاتی ئەوروپای ناوەڕاستمان بەردەست دەخات. کتێبەکە ناوی *دانوبە* و چاپی ١٩٨٦ و کلاودیۆ ماگریس نووسیویەتی. تا ئێستا نەکراوە بە عەرەبی، بەڵام ڕەنگە پاییزێک ئەم نووسەرە ئیتالییەی شارەزاییەکی باشی لە ئەدەبی ئەڵمانیدا هەیە، خەڵاتی نۆبڵ وەر بگرێت و ئەوکات وەرگێڕانی کارێکی ئاسان دەبێت.

ماگریس لەو کتێبەیدا، سەفەرەکەی قەشەی بەریتانی دنتۆن بۆ سربستان لە ساڵی ١٨٦١دا باس ناکات، ڕەنگە ئاگاداری کتێبەکەشی نەبێت بە ناوی *سربستان و سرب*، کە ساڵی ١٨٦٢ لە لەندەن چاپ بووە. ئەگەر یەکێک

ئەو کتێبەی دنتۆن پیشانی ماگریس بدات، ئەوا لە بەردەم ئەو گەشتەی بەناو دەریادا دەیکات و لەگەڵ وەسفکردنی ڕووەک و باڵندەکان، ئێستێک بکات و ببینێت ڕاپۆرتەکەی دنتۆن چۆن لەگەڵ یەکێک لە سەرچاوەکانی دانوبدا، کە هەنگارییەی و ناوی کانتزە، یەکتری دەبڕن.

هەردوو ڕاپۆرتەکەی دنتۆن و کانتز، یەکەمیان لە ساڵی ١٨٦١دا نووسراوە و دووەمیش لە ١٨٧٠دا، باس لە دیمەنی دیلەکانی ناوچەی جەبەل لوبنان دەکەن، کە چۆن ئیمپراتۆریەتی عوسمانی نەفیی کردبوون. دنتۆن لە قەلایەکی سپیی شاری بولگراددا، ئەو زیندانییانەی بینیوە، کە چۆن برسێتی بڕستی لەبەر بڕیون. هەرچیی کانتزیشە، دوای نۆ ساڵ ئەو زیندانییانە لە ئاوی دانوبدا دەبینێتەوە، کە چۆن بە ئاسن و زنجیر کۆت کراون. ئەبێ چی ئەوانەی لە بولگرادەوە بردبێت بۆ گوندێکی چەپەک و دووردەستی وڵاتی بولگارستان؟ تۆ بڵێی بەڕێی گەڕانەوەوە بووبن بۆ گوندەکانی خۆیان لە وڵاتی شام، یاخود ئەوە دواسەفەریان بووە بۆ ئەو شوێنەی کەس لێی ناگەڕێتەوە؟

سەرچاوە مێژووییەکانی خۆمان، هیچ شتێکی وامان بۆ باس ناکەن. نیچە داوای دەکرد چارەنووسمان خۆش بوێت. شتێکی ئەوتۆ دەربارەی چارەنووسی دیلەکانی سەدەی نۆزدەهەم نازانین، ئەو دیلانەی لە کتێبەکەی ماگریسدا باسیان هاتووە و دەربارەیان دەڵێت، "ئەوانە وەک باڵندەی ناو قەفەس دیل کرابوون." ئەو تاکە دێڕە لە چاپە ئینگلیزییەکەی کتێبەکەیدا، خەیاڵ ئەبزوێنێ.

لـە نەسـکێکی تـری کتێبەکەیـدا، ماگریـس سـەردانی نەخۆشـخانەیەک دەکات، ئـەو شـوێنەی کافـکا بێهوودانـە دەیویسـت لـە نەخۆشـیی سـیل ڕزگاری بکات و چـاک بێتـەوە. لـەو کتێبەیـدا کـە پڕیەتـی لەنـاو، باسـی ئیڤـان کلیمـا نـاکات. تەنانـەت کۆندێراش تەنهـا جارێـک نـاوی دێـت و ئەمـەش نابێتـە مایـەی ئـەوەی لـە کۆتاییی کتێبەکـەدا و لـە پێڕسـتی ناوەکانـدا جێگـەی ببێتـەوە.

ماگریـس و ئیڤـان کلیمـا، تێڕوانینیـان بـۆ کافـکا وەک یەکـە و بگـرە نزیکایەتییەکـی ڕۆحییـش لەنێـوان هەردووکیانـدا هەیـە. خوێندنـەوە سـەرچاوەی وەهـم و فانتازیایـە. ماگریـس وەسـفی سـیمای هـاوڕێ کچەکـەی دەکات لـە شـەودا. تیشـکی گڵۆپەکان ئـاوی دانـوب ڕەنـگ دەکـەن و ئـەو ڕەنگـەش، لەسـەر ڕوومەتێکـی سـپی و ناسـک شـەوق ئەداتـەوە. سـەروەختێک کچێـک لـەو کچانـە دەبینێـت، کـە لـە گازینۆکـەدا خزمـەت دەکـەن بـە تەنوورەیەکـی سـپیی کورتـەوە بەسـەر مێزەکانـدا دەگەڕێن، شـتێکی بیـر دەکەوێتـەوە. ئەمـەش بـە سـەرەتای ڕۆژانەکانـی کافـکا دەچێـت. کافـکا لـەو قۆناغـەدا کوشـتەی وەسـفکردنی ئـەو ژن و خانمـە ئەکتەرانـە بـوو، کـە لـە شـانۆکان دەهاتنـە دەر. هەنـدێ وردە شـت هەیـە، بەقـەد کتێبێکـی چەندبەرگـی زانیاریمـان بەردەسـت دەخـات.

خوێنـەری کافـکا دەتوانێـت مەزەنـدەی ئـەوە بـکات، کافـکا چـۆن لـە سـاڵی ١٩١٧دا، شـەوانە دانیشـتووە تـا شـوورای مەزنـی چیـن یـان ڕاپـۆرت بـۆ ئەکادیمیـا بنووسـێت. دەتوانێـت ئـەوە بێنێتـە بەرچـاوی خـۆی، چـۆن لـە سـاڵی ١٩١٤دا *ڕێگـەی ئاسـنینی کلـدای* نووسـیوە. چـی کافـکای بـەرەو ئـەو شـوێنە

فانتازییە دوورانە دەبرد؟ لەنێوان ساڵانی ١٩١٤ و ١٩١٧ کێشی دادەبەزێت. دوای ١٩١٧، لاوازتر دەبێت و چاوانی زەق دەبن. میکرۆبی سیل بە هیچ تێر نابێت و هێدی هێدی لە ناوەوە ئەو نووسەرە لاوە دەخوات.

ئیڤان کلیما لەگەڵ کافکادا تەماهی دەکات، بەڵام بەوریاییەوە. وەکوو چاپاکۆڤسکییش پەنا بۆ هێزی ئیرادە دەبات، تا بەسەر خەم و ئازارەکانیدا زاڵ ببێت. کسینگیان لە کۆتا لاپەڕەکانی *ئینجیلی پیاوێکی تەنها*دا، پەنا بۆ میوزیسانێکی دی دەبات، تا نەمرێت و بەزیندوویی بمێنێتەوە. خەم هەوێنی شیعرە و نێوان دێڕبەدێڕی نووسینەکانی ماگریسیش پڕ لە شیعرە، بەڵام شیعرێکی بەنرخ، کە هەر وا بەئاسانی خۆیان بەدەستەوە نادەن.

دانوب دەڕژێت و لەگەڵیشیدا مێژووی ئەورووپا دەڕژێت و ڕێ دەکات. سەردەمی نازیزم (سەرشێتیی ئەڵەمانیا)، لە هۆشیاریی ماگریسدا شوێنێکی سێنترالی هەیە... سەردانی قەڵا و گۆڕستانەکان و کامپەکانی جینۆساید دەکات... شوێنپێی ئۆردووی ئەو مرۆڤانە هەڵدەگرێت، کە ڕۆژگار و چارەنووس کاڵی کردوونەتەوە. لە ڕۆمانیا بەدوای چارەنووسی ئەو کەمینە ئەڵمانییەدا دەگەڕێت، کە لەوێدا ژیاون.

کۆدێتاکانی مێژوو ئەوەمان پێ دەڵێن، کە ئەدەبی کەمینەی ئەڵمانی لە ڕۆمانیا، ئەدەبێکی بێدەنگکراو و سانسۆرکراوە. لەم سەروبەندەدا، باس لە خانمەنووسەرێک دەکات، ناوی هێرتا مۆلەرە، کۆمەڵەچیرۆکێکی نووسیوە، پاشان ڕێگەیان نەداوە بڵاو ببێتەوە. دوای ئەوە تێدەگات دەبێت لە مێشکی خۆیدا *سەرزەمینی قۆخی سەوز* بنووسێت. هێرتامۆلەر

لـە کۆتاییـی ئـەو ڕۆمانەیـدا، کـە چەنـد سـاڵێکی کـەم دوای کتێبەکـەی ماگریس چـاپ کـرا، وەسـفێکی وردی شـتنی لاشـەی مردوویـەک دەکات. ئەسـتەمە نووسـەرێک ئەزموونـی حاڵەتێکی وای نەکردبـێ و بتوانێـت وەسـفێکی وا بنووسـێت.

ئـەدەب ناتوانێـت ڕووی خـۆی لـە دیمەنـی مـەرگ وەر بگێڕێـت. ڕەنگـە وێنەگرتنـی دیمەنـی مـەرگ، چرکەسـاتی تاقیکردنـەوە و هەڵسـەنگاندن بێـت بـۆ ئـەدەب. ئـەو مـردووەی مۆلـەر باسـی دەکات، کێیـە؟ داپیرەیەتـی، کـە لـە دواسـاڵەکانی تەمەنیـدا دەخلافێـت. دوای شوشـتنی لاشـەکەی، دەبێـت کفـن بکرێـت. دوگمـەی کفنەکـە لێبۆتـەوە، کچەکـەی یـان کچەزاکـەی (نازانـم کامیانـن) و کتێبەکەشـم ئێسـتا لا نییـە، خوێنـەر خـۆی دەتوانێـت یەکێکیـان هەڵبژێرێـت، دەچێـت بەکـرە و دەرزییـەک دێنێـت و دوگمەکـە تونـد دەکاتـەوە، بەسـەر لاشـەی مردووەکەدا دەچەمێتـەوە و بـە ددانەکانـی بەکرەکـە دەقرتێنـێ. ئەمـە لـە ئەدەبـی تۆلسـتۆی دەچێـت (تەنهـا ئـەم چاپتـەرە)، بـەڵام ئـەم جارەیـان ژنێـک لـە ڕۆمانیـا دیمەنێکـی وا دەنووسـێت.

لـە دەسـپێکی ڕۆمانـی سـەرزەمینی قۆخـی سـەوزدا، کـە لە سـاڵی ١٩٩٣دا چاپ کراوە، باسـی شـوێنگەلێک دێت، ڕێک و ڕاسـت دەمانباتـەوە لای کتێبەکـەی ئەلیاس کانیتی *ئاپۆرە و هێز*. کرێـکاران لـە کارگەکـەدا، بـە دەسـتبەرزکردنەوە دەنـگ دەدەن. زمانـە ترسـاوە نوکتێژەکـەی هێرتامۆلـەر، بە دوو ئاراسـتە بریندارکـەرە. دژوارتریـن کات لەگـەڵ ئـەو کچـە هاوڕێیەیـدا دەبێـت، کـە دەبێتـە سـیخوڕ (لانـی کـەم لـە مێشـکی مۆلـەردا). هەمـوو ئەمانـە لـەو سـەرەتایانەوە سـەرچاوە دەگـرن و لەنـاو ئاپـۆرەی ئـەو خەڵکـەوە دێـت،

کە لە کارگەکەدا چەپڵە لێدەدەن. ئەمانە وەک زیندەوەرێک وەهان، زیاد لە دەستێکیان هەبێت، بەڵام بە یەک سەرەوە.

ماگریس لە بولگاریا دەچێت بۆ خانوویەکی کۆن، ئەو خانووەی کانێتی تێدا گەورە بووە، بەر لەوەی ڕێگەی تەراوگە بگرێتە بەر و ڕوو بکاتە خۆرئاوا. ماگریس خوێندکارێکی ڕۆحیی ئەلیاس کانێتییە، لەگەڵ ئەوەشدا، سەختگیرە لەگەڵیدا و ڕەخنە لە ژیننامەکەی دەگرێت، کە سێ بەرگە.

ماگریس پێی وایە، ئەو تاکە ڕۆمانەی لە ساڵی ١٩٣٥دا چاپ بووە، ناوازەترین کاری کانێتییە. ئەو کاتە کانێتی لە ڤییەننا دەژیا و تەمەنی سی ساڵان بوو. هەرچیی ئەو شتانەی دیکەی کە نووسیونی، بۆ ئەوە بووە خەڵکی بەو ڕۆمانە لەبیرکراوەی ئاشنا بکات. تەنانەت کتێبی *ئاپۆرە و مێزیش*، بە شێوەیەک لە شێوەکان، ڕوونکردنەوەیەکی مێژوویی-دەروونییە بۆ ئەو ڕۆمانەی.

ئەمە بەوە دەچێت، لەپڕێکدا کافکا لە لەندەنی دوای دووەم جەنگی جیهانیدا پەیدا ببێت (وەک پیرەمێردێکی گورجوگۆڵ)، تا ژیاننامەی خۆی بنووسێتەوە و لە نووسینی دادگایی و ئەمەریکا ئاگادارمان بکاتەوە؟ بۆچی ماگریس یەخەی کانێتی دەگرێت؟ لەو ماڵە کۆنەدا دەست بە گەڕان دەکات و بەر لەوەی ئەوێش جێ بێڵێت، بیری ناچێت لەگەڵ هاوڕێکانیدا کارتێک بۆ کانێتی پۆست بکات لە جنێف.

کانێتی لە بیرەوەرییەکانیدا، کە دوای مردنی بڵاو کرایەوە، باس لە هاوڕێکانی دەکات لە شاری لەندەن لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەمدا (بیرەوەرییەکانی کانێتی ساڵی

۲۰۰۳، چاپە ئەڵمانییە کەی و ساڵی ۲۰۰۵ چاپە ئینگلیزییەکەی کـــەوتە بەردەستی خوێنەران). لە بەشێکی دیکەی ئەو بیرەوەرییانەیدا، کانیتی دەبینین لە ئاهەنگێکی سەماکردندا، تا دوای نیوەشەو بەردەوام دەبێت، لەو کاتەشدا فڕۆکەکان لە ئاسمانی لەندەندا شەڕ دەکەن.

بەر لە دەستپێکردنی هێرشە ئاسمانییەکان بۆ سەر شاری لەندەن، پیاوێکی ئینگلیزی پرسیاری ڕەگەزنامەی لێ دەکات و لە ئەسڵوفەسڵی دەپرسێت. ئەم گفتوگۆیە لە پارکێکی لەندەن و لەناو گوڵ و دارودرەختدایە. کانیتی وەڵامی پرسیارەکەی دەداتەوە و دەڵێت، "من خەڵکی گوندێکی بولگاریام لەسەر ڕووباری دانوب." لە لەندەن وەک نووسەرێک سەیریان دەکرد، کە لە ڤییەننا ڕزگاری بووە، چونکە لە ڤییەنناوە هاتبووە لەندەن و ماگریس بە کوڕی ئەورووپای دادەنێت.

کافکا لە ساڵی ۱۹۲٤دا دنیای بەجێ هێشت، کانیتییش لە ساڵی ۱۹۹٤دا. ئەو چیکی و بولگاریەی بە زمانی ئەڵمانی دەیاننووسی، بەڵام ماگریس بەئیتالی دەنووسێت. کە دەچێتە بۆدابست و باس لە ئەدەبی هەنگاری دەکات، ناوی خاتوو ئەگۆتا کریستۆڤ ناهێنێت، ئەو خانمە نووسەرەی دواجار ڕوو دەکاتە سویسرا و بە زمانی فەرەنسی دەنووسێت. سەروەختێک ماگریس ساڵی ۱۹۸٦ دانوبی بڵاو کردەوە، ئەگۆتا کریستۆڤیش سێینەکەی خۆی بڵاو کردەوە و لە ڕێی جمکێکەوە بە ناوی لۆکاس و کلاوسەوە، مێژووی ئەورووپای ناوەڕاست دەگێڕێتەوە، بەبێ ئەوەی ناوی یەک شوێن بێنێ.

ئایا کانیتی کوڕی ئەورووپایە؟ سەروەختێک لە مەراکیش حوشتر دەبینێت بەرەو سەربڕین و کەوڵکردنی دەبەن، چیی

بیر دەکەویتەوە؟ تۆ بڵێی کەمپەکانی جینۆسایدکردنی بیر بێتەوە؟ ئایا کافکا ڕۆڵەی ئەورووپایە؟ بۆچی شووورای چینی نووسی؟

کانیتی دەربارەی نامەکانی کافکا کتێبی نووسیوە و ویستوویەتی - بێ ئەوەی باسی بکات - دابنیشێت لەتەکیا و قسەی لەگەڵدا بکات. دوو کەس نێوانێک لەنێوانیاندایە و ساڵەوساڵ نـــامەی کورت بۆ یەکدی دەنێرن. یەکێکیان بەوی دیکەیان دەڵێت - بێ قسە و بێ ورتە - من لێرەم، هێشتا مـــاوم و دەخوێنمەوە. ڕەنگە بەدحاڵیبوون و کەمیی زانیاری لێکیان دوور بخاتەوە، لێ لینکێکی نهێنی لەنێوانیاندا هەیە و ناپسێت. ئاخۆ نهێنیی ئەوە چییە؟ تۆ بڵێی خۆشویستنی خەیاڵ و فانتازیا بێت؟

لە شاری لەندەندا و لەو کاتەوەی فڕۆکەکانی هیتلەر شارەکەیان بۆمبباران دەکرد، کانیتی خەریکی خوێندنەوەی شیعری فەیلەسووفانی تاویزم بوو، هەر لەو سەردەمەشدا سەفەرەکەی هیندستانی ئیبن بەتوتەی خوێندەوە. ئاپۆرە و هێز، تا ئێستا وەر نەگێڕدراوەتە سەر عەرەبی، هەرچەندە کتێبەکە قەرزارباری بابوباپیرانی ئێمەیە. ئەبێت ئێمە کێ بین؟

کافکا کێ بوو، کاتێک بەژێر خۆرەتاوی وڵاتی چیندا ڕێی دەکرد و لەگەڵ ئەو کەسانەدا قسەی دەکرد، کە شووورای بەرزی ئەو وڵاتەیان هەڵچنیبوو، پاشان لە سێبەری درەختێکدا پشوویەکی دەدا و چاییەکی فڕ دەکرد. ئارەق بە لاشەیدا دێتە خوار و کراسەکەی بە شان و باڵیەوە دەلکێت. بەر لەو، شاعیرانی تاویزم لەژێر ئەو درەختانەدا دانیشتوون. لەوێدا، ڕێگەیەکی سەوز هەیە و ئوتومبێلی پیا ڕەت نابێت.

ئەو خەڵکەی بەوێدا تێپەڕ دەبن، کەمێک لای سەکۆیەکی بەداردروستکراو ڕادەوەستن، کە فرۆشیارەکان خۆراک و خواردنەوەی سارد و گەرم و شیرینییان لێ داناوە. یەکێک نەخۆشە و لە دوورەوە هاتووە بۆ ئەوێ. خەڵکی ئەڵێن چاوەڕێی پۆست دەکات و دەڵێن ئیمپراتۆر نامەیەکی بۆ نووسیوە.

ئەبێت ئەو نامەیەی ئیمپراتۆر چیی تێدا بێت؟ وشەکان چۆنچۆنی زەریاکان دەبڕن؟ تۆ بڵێی کێ بگات و کێ ون ببێت و سەری تیا بچێت؟ ماگریس دەگاتە بەندەرەکە و لەوێوە دانوبی مەزن دەبینێ. ئاوێکی لێڵ و لیخن دەڕێژێتە ناو دەریاری ڕەشەوە. هەر وا بەئاسانی ئەو بەندەرە و سەرچاوەکەی نەدۆزیوەتەوە؟ تۆ بڵێی ڕێگەی دۆزیبێتەوە و دانوبی ئەوروپا بەڵەد بێت؟ ئەوەی سەیرە، زۆر باسی ڕووبارەکە ناکات. ئایا ڕووبارەکە خەیاڵییە؟ لە بەردەم دەرگا ئاسنینەکاندا دەوەستێت و وەکوو قەشە دنتۆن، بیر لە خۆرهەڵات و خۆرئاوا و ئەو سەرزەمینانەی تر دەکاتەوە، کە ئاسەواریان نەماوە.

سارکوزی ڕۆڵەی ئەورووپایە؟ ئەم هاوینە قەرەجەکان لە پاریس دەر دەکات. ئەوانە بولگاری و ڕۆمانین. چی گەیاندوونیەتە پاریس؟ بۆچی سینیان بەلاوە پەسەندترە تا دانوب؟ بۆ ئەوان چاکتر نەبوو لە سەدەی نۆزدەهەمدا بمانایەتەوە. چاکتر نەبوو لە ماڵەکانیان بمانایەتەوە و ڕۆحی خۆیان قوتار نەکردایە. قوتاربوون خەیاڵپڵاوە. کێ قوتاری دەبێت؟ ئەو قەرەجانە خانە و لانەیان نییە. (با) خانە و لانەیانە. کانیتی گەر سبەی یان دوو سبەی سارکوزی لە

ئاهەنگێکی سەمادا ببینێ، چیی پێ دەڵێت؟ کافکا لە کونجێکدا دانیشتووە و دووکەڵێک دای پۆشیوە، دەکۆکێت و بە چاوی قەرەجێک سەیری پیاوێک دەکات، قاتێکی ڕەشی پۆشیوە و جووتێ پێڵاوی ڕەشی لەپێدایە.

بیر لە چی دەکاتەوە؟ لە چاوەڕوانی وەڕس بووە؟ خەڵکێکی زۆر بوون و لە ڕووبارەکە دەپەڕینەوە... پێش چەندین سەدەیەک و بێ ئەوەی بە خۆیان بزانن، لە ئەلیادەدا لە ڕووبارێک پەڕینەوە و هۆمیرۆس لێگەڕا ئەخیلی تووڕە و سەرشێت سەریان ببڕێت. ئەوانە کێ بوون؟ ئەی ئێمە کێین؟

دانوب ئاوەکەی دەڕێژێتە ناو دەریای ڕەش و کەشتییەکانیش تێدەپەڕن و ڕێگەی خۆیان دەبڕن. لە پارکێکی سارد و بچکۆلەی ژێر قوللەی ئیڤلدا، کە ڕازاوەتەوە بە ڕەنگی هەزاران گڵۆپ، کیژۆڵەیەکی جلشین وەنەوز دەدا و سەری ناوەتە سەر شانی دایکی. سیمای دایکی دیار نییە، گەر ڕووناکی لێی بدات و ڕووی دەر بکەوێت، ئەوا کافکا وەسفێکی دەکات و وێنەی دەگرێت.

# نامەیەک بۆ گابرێل گارسیا مارکیز

مارکیز ئەم نامەیە ناخوێنێتەوە. بەختی باشە. تەمەنی هەشتاودوو ساڵە و لەنێوان ئەوروپا و ئەمەریکادا دەژی. بەیانییانیش ڕۆژنامە عەرەبییەکان ناخوێنێتەوە... بۆخۆی حەزی لە بواری ڕۆژنامەنووسییە و ساڵانێکە لە کۆلۆمبیا خاوەنی ڕۆژنامەیەکە، بەڵام وەک پێویست عەرەبی نازانێت. خەڵکوخوای وڵاتانی جیهانی سێ، بەسەر زمانێکی زۆردا دابەش بوون، زیاد لە حەفتاودوو زمان. ناشزانین چی کۆیان دەکاتەوە. دڵنیام ئەم نامەیە ناخوێنێتەوە. تەنها شتێک وا بکات ئەم نامەیە بگاتە سندوقی پۆستەکەی، سەرەڕۆیی کەسانی ترە. وەک ئەوەی کەسێکی نەناسراو پەیدا ببێت و ئەم وشانە بەوەرگێڕدراوی بخاتە بەردەستی.

ئەو لە ئێستادا تەمەنی هەشتاودوو ساڵە و نامە و نامەکاریی بەلاوە گرنگ نییە. دەڵێت، "دەستم قەڵەم ناگرێت،" ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت، وازی لە نووسین هێنابێت. ئایا بڕوا بە خۆی دەکات؟ ناوبەناو، هەریەک لە ئێمە، دەگەڕێینەوە سەر سەدساڵ تەنیایی و دەست بە خوێندنەوەی ژیان دەکەین لە ماکۆندۆدا. ئەو دەخوێنێتەوە و مارکیزیش بۆ خاتری ئەو

دەنووسێت. ئەم پیاوە بۆ یەک چرکە لە نووسین ناوەستێت. هەر بەڕاست پێی وایە وازی لە نووسین هێناوە؟ (دوێنێ ڕۆژی دووشەممە، ٦ی نیسانی ٢٠٠٩، جارێکی دی سەدساڵ تەنیاییی نووسی).

سەروەختێک بۆ یەکەم جار ئەو کتێبەی نووسی، لە تەمەنی چل ساڵیدا بوو. چاپی یەکەمی سەد ساڵ تەنیایی، لە سەروبەندی شەڕی شەش ڕۆژەی حوزەیرانی ١٩٦٧دا بوو. بەیانییان ڕۆژنامەکانی بۆگۆتا و بۆینس ئایرسی دەکردەوە (چاپی یەکەمی سەدساڵ تەنیایی لە بۆینس ئایرس بوو)، تا شتێک دەربارەی ڕۆمانەکەی بخوێنێتەوە، (تۆ بڵێی وای کردبێ؟) شتگەلێکی دەربارەی شەڕ لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا خوێندۆتەوە و چەند سیگارێکیشی کێشاوە.

ماکۆندۆ حەقیقەتە و شەڕەکانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیش درۆن. نوقمی ناو دووکەڵی سیگارەکانی دەبوو، لەو کاتەشدا چاپی یەکەمی ڕۆمانەکەی یەک دانەی نەما. دەڵێت، "پێم سەیر بووە و شتێکی چاوەڕواننەکراو بووە،" ئەو خانەی وەشانەشی کتێبەکەی بۆ چاپ کرد، چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد. بێگومان خوێنەرانیش بەلایانەوە سەیر بووە و چاوەڕێی ئەوەیان نەکردووە. ماکۆندۆ ئەو جیهانە واقیعی و فانتازییە بوو، هەمووانی حەپەساند. واقیع چییە و فانتازیا چییە؟ مارکیز ناتوانێت لێکیان جیا بکاتەوە.

ئەوە چوارەمین ڕۆمانی بوو، ڕەنگە پێنجەمیش بووبێت. ئایا سەروەختێک ساڵی ١٩٦١، *کەس نییە نامە بۆ کۆلۆنێل بنێرێ*ی نووسی، ئەوەی بە بیردا دەهات، کاتێک باسی ئۆریلیانۆ بۆنیدیا دەکات لەو ڕۆمانەدا (ئەو جەنگاوەرە

ئەفسووناوییە)، دوای چەند ساڵێکی دی، سەرلەنوێ لە ڕۆمانێکی دیکەدا دەربارەی خانەوادەکەی و کەسوکار و منداڵەکانی دەر دەکەوێتەوە؟ بەڵام ئەمە کۆلۆنێلێکی دیکەیە و پیرەمێرد نییە و دەتوانێت خۆی بە یەکێک لە گرنگترین کارەکتەری ناو ڕۆمانەکان دابنێت لە مێژووی ئەدەبدا. ئەم کارەکتەرە، سیودوو جەنگی بچووکی ناوخۆیی بەرپا دەکات.

ئەبێت هێزی تەلیسماویی ئەم ڕۆمانە لەکوێدا بێت؟ لە دروستکردنی ئەو گوندە میتۆلۆژییەدایە بە ناوی ماکۆندۆ، یاخود لەو کارەکتەرانەدایە، کە لە بەردەمماندا دێن و دەچن، یان لەو چیرۆک و بەسەرهاتانەدایە، کە بە شێوەیەکی هونەریی زۆر دانسقە چنراون؟

مارکیز چۆن واز لە نووسین دێنی؟ تەنانەت ئەگەر لە تەمەنی چل ساڵیشدا دەستبەرداری نووسین ببووایە و یەک دێڕیشی لە *پاییزی پاتریارک* - ١٩٧٥ و *ڕووداوی مەرگێکی ئاشکرا* - ١٩٨١ و *خۆشەویستی لە سەردەمی کۆلێرا* - ١٩٨٥، نەنووسیبایە و بەبێ هەموو ئەم کتێبانەش، کەس لە ئێمە نەیدەگوت ئەو بێدەنگە و هیچ نالێت. ئەو پیاوە بەبێ وچان قسەمان لەگەڵدا دەکات. ئەری وازی لە جگەرەکێشان هێناوە؟

کافکا چرنووک لە گەردنی گیر بوو، بێ ئەوەی سیگارێک پێبکات. ئەدی مارکیز؟ تەمەنی هەشتاودوو ساڵە، بەڵام تا ئەبەد لە تەمەنی چل ساڵی و بگرە پێش چل ساڵیشدا دەمێنێتەوە. سەدساڵ تەنیایی لە ماوەی یەک ساڵدا نووسی ١٩٦٦. ڕەنگە چەند مانگێکیشی خایاندبێ؟ پازدە مانگ؟ تەنها حەوت مانگ و هیچی تر. لەوانەیە وەڵامێکمان بداتێ، بەڵام ئاخۆ بڕوا دەکەین؟ خوێنەر چۆن باوەڕ بە کەسێک دەکات،

هەموو ئەو ڕۆمانانەی نووسیبێت؟
لە چ کاتێکدا خەنی بووە و بەختەوەری تەوقی داوە؟ لەو کاتەی جۆزی ئەرکادیۆ دەستی درێژ دەکات و ڕێبیکا قۆڵبەست دەکات؟ یان ئەو کاتەی شازدە پیاو یەک ناویان هەیە، بە ناوی ئۆریلیانۆ و گوللە هەڵیان دەبڕێت؟ کەی هەستی کردووە بەسەر شەپۆلێکی فانتازییەوەیە و بەبێ ئەوەی بە خۆی بزانێ، وێنەکان شاڵاوی بۆ دێنن، کاتێک باس لە جۆزی ئەرکادیۆی دووەم دەکات، باسی ئەو کاتەی لەناو شەمەندە(نە)فەرێکدا و لە شەوێکدا، لەناو مردووانندا ماکۆندۆ جێ دێڵێت؟
ڕەنگە ئەو لاپەڕانەی باس لە گەڕانەوەی ئەو پیاوە دەکەن، بەژێر باراندا و بە سەرشکاوی و قژێکی خوێناویی وشکەوەبوو، قەشەنگترین لاپەڕەکانی ڕۆمانی سەدساڵ تەنیایی بن. سەروەختێک خۆی دەکات بە مەتبەخەکەدا، شڵەژاو و وەک تارماییەک و ناوی خۆی بە ژنەکە دەڵێت، تا دڵنیا بێت کە هەیە. قاوەیەکی بێشەکری بۆ تێدەکات و سەروەختێک دەیخواتەوە (ئایا دەیخواتەوە؟) دەزانین کە زیندووین، ئایا ئێمە زیندووین؟
دوای ئەو بارانەی بۆ ماوەی چوار ساڵ و یازدە مانگ و دوو ڕۆژ بەردەوام دەبێت، ئۆریلیانۆی دووەم دێتە دەر، تا سۆراخی ماکۆندۆ بکات. لەو کاتەوە مارکیز بۆ خاتری خوێنەرگەلێکی عەرەب دەنووسێت، کە نە دەیانناسێت و نە دەیناسن: (ئەوانەی لە کارەساتەکە ڕزگاریان بوو، دانیشتووی ماکۆندۆ بوون، بەر لەوەی زریانی کۆمپانیای مۆز بیهەژێنێ). بە چاوی خۆی بینیونی، چۆن لەناو شەقامەکەدا دانیشتوون

و خۆیـان بـەر خـۆر داوە و قـەوزە بـە جەستەیانەوە دیـار بووە و لەگەڵ بۆنی پێخەفەکانیاندا، کە باران تەڕی کردبوو. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆشحاڵ بوون، لەبەر ئەوەی دواجار گوندەکەی خۆیان دەدۆزنەوە، ئەو گوندەی تێیدا لەدایک بوون. شەقامی - ترکۆش وەک جاری جارانی لێ دێتەوە. شەقامی ئەو عەرەبانەی گوارەیان لەگوێ دەکرد و دنیایان تەی دەکرد، تا تووتییەکان بە یاری بگۆڕنەوە.

دواجار لە ماکۆندۆدا کونجێکی بچووکیان دۆزییەوە، تا لەدوای ئەو کۆچە مێژووییەیان، پشوویەکی تێدا بدەن. لەو ساڵانەدا باران بەلێزمە دەباری، شمەک و کەلوپەلەکانیان لە بەردەم دوکانەکاندا قەوزە دەگرن. ڕووکاری دوکانەکان شێواو و دیوارەکانیش شێ لێی داوە. کەچی نەوەی سێیەمی عەرەبەکان، لە هەمان شوێندا و بە هەمان شێوەی بابوباپیرانیان، بەبێدەنگی دانیشتوون، نە هەڕەشە و مەترسی کۆڵیان پێ دەدات و نە ڕۆژگار و کارەساتەکانیش لە عەوەیان دێن. هەر وەک خۆیانن، لەدوای سیودوو شەڕی تاقەتپڕووکێنی سەرهەنگ ئۆریلیانۆ بۆیندیا. هێزێکی ڕۆحیی سەیروسەمەرەیان هەبووە، لە بەردەم مێزی یارییەکان و ئەو عەرەبانانەی خواردنی کولاو و سوورەوەکراویان دەفرۆشت، لەگەڵ ئەو شەقامە بچکۆلەیەی تەفسیری خەونیان تیا دەکرد و بەختیان تێدا دەگرتەوە.

کاتێک ئۆریلیانۆی دووەم وەک عادەتی هەمیشەیی خۆی، بە شۆخی و گاڵتەپێکردنێکەوە لێیان دەپرسێت، بە چی خۆتان لەو کارەساتە قوتار کرد و چیتان کرد تا نەخنکێن، یەک بەدوای یەکدا و لەم دەرگاوە بۆ ئەو دەرگا و بە هەمان بزە

و سەرنجی خەواڵووەوە، یەک وەڵامیان دەبێت (بەبێ ئەوەی ڕێک کەوتبن لەسەری)، لە وەڵامدا دەڵێن، "مەلەمان دەکرد."

لەم چاپتەرەدا، مارکیز بە ستایلە قەشەنگەکەی خۆی، باس لە دنیا و سروشتی نەوەی سێیەمی عەرەبەکان دەکات، کە لە کونجێکی ماکۆندۆدا لایان داوە، تا ماندوێتیی ئەو سەفەرە مێژووییەیان بحەوێتەوە، بەڵام ئەم چاپتەرە لەدوای یازدەی سێپتەمبەری ٢٠٠١وە چۆن گۆڕا؟ ئایا مارکیز ئەو دێڕانەی لەپێناو خوێنەرگەلێکی عەرەبدا نووسیوە، کە نە دەیانناسێت و نە دەیناسن؟ ئەم ڕستەیە بۆ سڕینەوەیە...

لە تەمەنی سیونۆ ساڵیدا، ئەم پیاوە چوار سەد لاپەڕەی نووسی (بۆ خاتری کەس نا، بەڵکوو لەبەر عەشقی خۆی بۆ نووسین). چوار سەد لاپەڕەی وای نووسی، ئەستەمە بیر بچێتەوە. کاتێک تەمەنی بوو بە چل ساڵان، سەیری کرد ئەو لاپەڕانەی نووسیونی، بوونەتە کتێب. ئەو ڕۆمانەی شتێکی خەیاڵی بوو، بوونی نەبوو، تەنها لە ناخی خۆیدا بوو، کەچی وا بۆتە کتێب و لەسەر مێزەکەیەتی. پاشان ئەو ژوورە داخراوە جێ دێڵێ و دەچێت بۆ بڵاوکردنەوە، دەڕوات بەرەو چاپخانە و ڕووناکی دەبینێت.

تۆ بڵێی دوای تێپەڕبوونی هەموو ئەو ساڵانە، مارکیز یەکەم چرکەساتی بیر بێتەوە، کە یەکەم ڕستەی سەرەتای کتێبەکەی تیا نووسیوە: "دوای ساڵانێکی زۆر و لە بەردەم دەستەی کوشتندا، کۆلۆنێل بیری کەوتەوە..." سەرووەختێک ئەم یەکەم ڕستەیەی نووسی، دەیزانی ڕووداوەکان بۆ کوێی دەبەن و بەشەکانی دیکەی چییان لێ دێت؟ ئایا دەیزانی دوایین ڕستە و وشەکانی کتێبەکەی چین؟ (ئەو بنەماڵانەی

سەد ساڵ گۆشەگیری بووە بە نسیبیان، جارێکی دی قەدەر دەرفەتێکی دیکەیان پێ نابەخشێت).

هەنووکە مارکیز تەمەنی هەشتاودوو ساڵە، کات چۆن دەباتە سەر و چی دەخوێنێتەوە؟ چیرۆکەکانی بۆرخیس، *ژیانی تیدۆ ئیزیدۆرۆ کروز، مەرگێکی تر، هەتەربوون، پیدرۆ سالفادۆرس*، یاخود سەرلەنوێ *ڕۆژانەی ساڵی تاعون* و *پیدرۆ پارامۆ* و *شووورای مەزنی چین* و *ئانا کارنینا* و دانتی و *کێوی ڕۆح* و *ئەلیادە* و شەکسپیر و *تەورات* دەخوێنێتەوە؟ چیی بیر دێتەوە کاتێک بۆ چەندەمین جار کتێبێکی کۆن دەخوێنێتەوە، کە زۆر دڵخوازی بووە؟

تۆ بڵێی بیر لە کات و بەسەرچوونی ئەو هەموو ساڵە بکاتەوە؟ ئایا بیری گوندی سەردەمی منداڵیی خۆی دەکات، بیری داپیرەی دێت، کە بە ئۆرسۆلا دەچێت و بە تەنوور پەنجەکێشی و کولێرە و کولیچەی بۆ دەکرد؟ ژیان چۆن تێپەڕی و چی دەمێنێتەوە و چیی بیر دەچێتەوە؟ لەنێوان ئیسپانیا و مەکسیک و کۆلۆمبیادا، چەند هات و چوو؟ بۆ ماوەیەکیش لە پاریسدا ژیا، چۆن ئەو ڕۆژانەی بە خەیاڵدا دێت؟ لە دیمانەیەکیدا کە هیی ساڵانی هەشتاکانی سەدەی پێشووە، باس لەوە دەکات، "ئاگادارە خوێنەری عەرەبیزمانی هەیە و بەرهەمەکانی چاپ دەکرێن، هەرچەندە هیچ خانەی وەشاندنێک پەیوەندیی پێوە نەکردووە، تا مافی وەرگێڕان و بڵاوکردنەوەیان وەر بگرێت."

تۆ بڵێی گوێی بەو شتانە دابێت، یان هەر ختووکەی خوێنەرە خەیاڵییەکانی داوە؟ سەدساڵ تەنیایی بەعەرەبی هەیە و زیاد لە جارێکیش وەر گێڕدراوەتە سەر عەرەبی.

بەرهەمەکانی دیکەشی هەر وایە. تۆ بڵێی ئەمە بۆ ئەو گرنگ بێت؟

ئەم نامەیە ناخوێنێتەوە. ئەری مارکیز حەز بە وشەی یەکتربڕ دەکات؟ ڕەنگە ئەو وشەی یەکتربڕە لە ڕۆژنامەیەک بکاتەوە و بەیانییان خۆی پێوە خەریک بکات. ئەی حەز بە ڕۆشتن و وەرزش دەکات؟ حەز بە ناوئاو دەکات و لە حەوزێکی لاکێشەییدا پشتەمەلە دەکات؟ ئەی کاتێک بە ڕۆژدا سەرخەوێک دەشکێنێ، کارەکتەرەکانی دێنە بەرچاوی و دەست درێژ دەکات و کۆلۆنێل بۆنیدیا ڕادەگرێت؟

ژیانی کۆلۆنێل ئەو ڕۆژە تەواو بوو، کە سێرک و قەرەجەکان گەڕانەوە بۆ ماکۆندۆ. مێشوولەی باڵدار، ئاسمانی ئەو گوندەی تەنیبوو. بەر لەوەی گیانی دەر بچێت، تەنیا لەژێر دارێکدا و لە حەوشەی پشتەوەیماڵەکەیدا، بیرەوەرییە کۆنەکانی بیر کەوتەوە. لە تەنیاییەکی قووڵ و کوشندەدا بوو.

ئەدی مارکیز؟ مارکیز لەناو ژمارەیەکی بێشوماری خوێنەراندا دەژی. ئەو خوێنەرانە خەیاڵین و لەسەر یەک مێزی نانخواردن لەگەڵیدا دانانیشن، وەلێ هەموویان دەیناسن. ئەوەشی ئەوان بەوەوە دەبەستێتەوە، هەر خەیاڵی و فانتازییە. لەسەر زەمینی پڕ تەلیسمی ئەدەبدا، ژیان بەردەوامە، ژیانێکی بەبڕشت و سەرمەدی.